# ج نوێژێك

# نرخەكەی بەهەشتە؟



نوسینی
عبدالملك القاسم

وەرگێرانی
باوكی محمد

چاپی دووەم
۲۰۰۹ زایینی ۱٤۳۰ كۆچی

# پێشەکی

برای ئازیز بەشی دووەمی زنجیرەی « **ئێمە هاوشانی ئەوان نین** » لە ژێر ناونیشانی ( **نرخەکەی بەهەشتە** ) لەبەر دەستت دایە کە باس لە بابەتێکی گرنگ دەکات ئەویش ( **نوێژە** ) ، کەمەندێ کەس رۆچون تێیدا هەندێکیش بەهیچ لەبەرچاویان گرتووە پشت گوێیان خستووە .

ئەم زەمەنەدا زەمەنی تەمەڵیو کەم توانایی و خۆخەریك کردن بەدنیاوە حەزم کرد کە باسێکی کارامەییو لێهاتویی ئەوانەی پێش خۆمان بکەین کە چۆن قۆڵی مەردایەتیان لێ هەڵکردووەو بەپەلە بون لە ئەنجام دانی ئەم کارە ( **نوێژە** ) بۆ ئەوەی بێتە مایەی زیندوکردنەوەو ژیانەوەیو دڵەکانو بزواندنی نەفسەکانو بەهێزکردنی هەڵوێستو بۆچۆن کانمان ... خوای گەورە کردەوەکانمان تەنها بۆ خۆی وەرگێرێ .

عبدالله بن محمد بن عبدالرحمن القاسم

بسم الله الرحمن الرحيم

إن الحمد لله ، نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور انفسنا وسيئات أعمالنا ، من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له ، وأشهد أن لاإله إلا الله وحده لاشريك له ، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله.

﴿ ياأيها الذين امنوا اتقوا الله حق تقاته ولاتموتن الا وانتم مسلمون ﴾ (آل عمران: ١٠٢)

﴿ ياايها ايها الناس اتقوا ربكم الذى خلقكم من نفس واحدة وخلق منها زوجها وبث منهما رجالا كثيرا ونساء واتقوا الله الذى تساءلون به والارحام ان الله كان عليكم رقيبا ﴾ (النساء: ١)

﴿ ياايها الذين امنوا اتقوا الله وقولوا قولا سديدا يصلح لكم أعمالكم ويغفرلكم ذنوبكم ومن يطع الله ورسوله فقد فاز فوزا عظيما ﴾ (الاحزاب: ٧٠-٧١)

**اما بعد فأن أصدق الحديث كتاب الله ، وخير الهدى هدى محمد (ﷺ) وشر الامور محدثاتها، وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة فى النار.**

# پێشەکی‌یەك دەربارەی نوێژ

نوێـژی لەئیسـلام دا پایەیـەکی بڵنـدی هەیـە کـەهیچ عیبـادەتێکی تـر هاوشانی نی‌یە . وەهەرئەمە کۆڵەکەی ئەم دینـەو بەبێ ئەمـەش تـەواو نابێت . پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێت: « رأس الأمر الإسلام و عموده الصلاة و ذروة سنامه الجهاد في سبيل الله »[1] ئەم کارە بەشی سەرەوەی ئیسـلامەو پایەکەی نوێژەو چڵەپۆپەکەی جیهادە لە پێناوی خوا .

نوێژیـش ئـەرکێکی واجبـەو بەبـەردەوامی ژیـانی بـەندەکان .. لەسـەر ئینسان لاناچێت هەتاوەکو ئەگەر ترسێکی زۆریش لەرێگەتدا بوو بۆ کردنـی خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿حافظوا على الصلوات والصلاة الوسطى وقومـوا لله قانتين فإن خفتم فرجالا أو ركبانا فإذا أمنتم فاذكروا الله كما علمكـــــم مـــالم تكونوا تعلمون﴾ (البقرة: ٢٣٨-٢٣٩).

یەکەم ئەرکە کەخوای گـەورە واجبـی کـردووە لەعیبادەتـەکاندا . یەکـەم ئەرکە کەخوای گەورە واجبی کردووە لەعیبادەتەکاندا . یەکەم لێپرسینەوەش لـەبارەی نوێژەوەیـە . کۆتاوەسیەتی پێغەمبـەری خـوا بـووە بـۆ ئوممەتەکـەی کەبجێ‌ی بهێنن لەکاتی سەرەم گیدا کەوە فەرمووێت: « الصلاة، الصلاة، وما ملكـت أيمـانكم »[2] نوێـژ ، .. نوێـژ ، وەکۆتـا واجبـە کـە نـامێنێت‌و بـەجێ نامێرێت ، ئەگەر ئەمیش وون بوو بەجێ‌نەمێنرا ئەوا دینیش نامێنـێ‌و لـەناو دەچێت پێغەمبەری خوا (ﷺ): « لتنقضن عرى الإسلام عروة عروة، فكلما انقضت عروة تشبث الناس بالتي تليها، فأولهن نقضا الحكم وآخرهن

(١) تورمزی و ئیبن‌و ماجەو ئەحمەد ئەریان هێناوەو ئەلبانی تصحیحی کردووە.
(٢) ئیبن‌و ماجەو ئەحمەد ئەریان هێناوەو ئەلبانی تەصحیحی کردووە.

الصلاة»[٣] بەشەکانی ئیسلام بەش بەش بەرەو لەناوچون دەچێت هەرکاتێك بەشێکی لەناوچوو نامۆبوو لەلای خەڵکی باوەش بەبەشەکانی تر دەکەن . یەکەم بەشیش کەنامێنێ حوکمڕانییە لەئیسلام کۆتا بەشیش نوێژە کەنامێنێ».

وە خوای گەورە بەیەکێك لەشەرتە سەرکییەکانی هدایەت و لەخواترسانی دادەنێت و دەفەرمووێت: ﴿الٓمٓ ذلك الكتاب لا ريب فيه هدى للمتقين الذين يؤمنون بالغيب ويقيمون الصلاة ومما رزقناهم ينفقون﴾ (البقرة: ١-٣)

وەخوای گەورە ئەوانەی نوێژ بەجێدەهێنن بەدووریان دەگرێت لە رەوشتە ناشیاوەکان و خراپەکان دەفەرمووێت: ﴿إن الأنسان خلق هلوعا إذا مسه الشر جزعا وإذا مسه الخير منوعا إلا المصلين الذين هم على صلاتهم دائمون﴾ (المعارج: ١٩-٢٣)

وە هەروەها کاتی پرسیار لەدۆزەخییەکان دەکرێت دەڵێن: کە لەنوێژکەران نەبوون خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ماسلككم في سقر قالوا لم نك من المصلين﴾ وە خوای گەورە هەڕەشەی گەورەی لەوانە کردووە کە نوێژ بەجێ ناهێنن دەفەرمووێت: ﴿فويل للمصلين الذين هم عن صلاتهم ساهون﴾ (الماعون: ٤-٥) بەواتای نەکردنیەت هەتاوەکو کاتەکەی دەڕوات و وەك ئەوەی کابرا نوێژی مغرب نەکات تا نوێژی عیشا بێت بەسەریداو ئەوکاتە هەردووکیان پێکەوە بکات بەبێ عوزر ...

وە خوای گەورە ئاگاداری بەندەکانی دەکات کە ئەگەر بەجێی نەهێنن ئەوا دۆزەخ جێگەو مەنزڵگایانە دەفەرمووێت: ﴿فخلف من بعدهم خلفٌ أضعوا الصلاة واتبعوا الشهوات فسوف يلقون غيا﴾ (مريم: ٥٩).

---

(٣) ئەحمەدو ئیبن و حیبان و حاکم دەریان هێناوەو ئەلبانی تەصحیحی کردووە؟

﴿غـــي﴾: شیوێکە لەشـیوەکانی دۆزەخ خولردنـی پیسـەو قولاییـیەکی زۆری هەیە خوای گەورە دایناوە بۆ ئەوکەسانەی کەنوێژەکانیان دەفەوتێنن‌و نایکەن ئەوفەرمانە خواییـیە بەجێ ناهێنن:

موسـڵمانان بەشـێوەیەکی زۆر گـەورە نرخاندیانـەو گرنگیـەکی زۆریـان پێداوەوە وەزۆر سوور بوون لەسـەر کردنـی بەشـێوەیەکی شـیاو پارسـتویانە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێشەوایان بوو لەئەنجام دانی ئەم کارە با عائیشە (ﷺ) بۆمان بگێڕێتـەوە: عائیشە دەفـەرموێت: « پێغەمبـەری خوا گفتوگۆو قسـانی لەگەڵدا دەکردیـن بـەلام هـەرکاتێ نوێژ بهاتایـە وەکـو کەسـێکی لێ دەهـات کـە هەرگیز ئێمەی نەناسیبێت‌و ئێمەش ئەومان نەناسی بێت».

ئەمـە پێشـەواکەمانە کەلەسـەر ڕێگەکـەی دەڕۆیـن‌و شـوێن پێـکـانی دەکەوێن.

وە پێشینەکانمان لەم ئوممەتە ئەم ڕێگەیەی پێغەمبـەریان (ﷺ) گرتـووە بەرو لایـان نـەداوە لێی ، چاوبکەن لە سعیدی کوڕی مسیب ئـەوەندەی سـوور بووە لەسـەر نوێـژ بۆمـاوەی (٤٠) سـاڵ پێـش ئـەوەی بـانگ بـدات لەمزگـەوت ئامادەبووە، (برد)ی خزمـەتکاری سـعید دەڵێـت: (بۆ ماوەی (٤٠) سـاڵە پێـش ئەوەی بانگبەر بانگدەر بدات بۆ نوێژ سعید لە مزگەوت ئامادەبووە .[٤]

ربیعەی کوڕی یزیـد دەڵێت: (٤٠) سـاڵە پێش ئـەوەی کە بـانگدەر بـانگ بـدات بـۆ نوێـژی نیـوەڕۆ مـن ئامـادەی نوێـژی نیـوەڕۆ بـووم مەگـەر نـەخۆش بوومایە یاخود لەسەفەر بوومایە).

وە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ڕێنموویمـان دەکـات بـۆ ئـەوەی کـە ئـەم خـێرە گەورەیە بپارێزین دەفەرموێت: « اعلموا أن خیر أعمـالکم الصـلاة ولایحـافظ

---

(٤) (طبقات الحنابلة (١٤١/١) ، حلیة الأولیاء (١٦٣/٢) ، صفة الصفوة (٨٠/٢).

على الوضوء إلا مؤمن»[٥] بزانن باشترین کردەوە لەکردوەکانتان نوێژە وەکەس دەست نوێژەکەی ناپارێزێ تەنها باوەڕدار نەبێت.

ئەوانە کۆمەڵێك بوون دڵیان پەیوەستی مزگەوت بووە وە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بۆیان مژدەدەربووە کاتێ دەیفەرموو: «سبعة يظلهم الله في ظله يوم لاظل إلا ظله ... رجل قلبه معلق بالمساجد إذا خرج منه حتى يعود إليه»[٦] حەوت کەس هەن خوای گەورە دەیانخاتە ژێر سێبەری‌یەوە .. یەکێکیان کابرایەکە کەدڵی پەیوەستە بەمزگەوتەوە ناتوانێت وەدوور کەوێتەوە لێی کاتێك دێتەدەرەوە لێ دڵی لایەتی تاوەکو دەگەڕێتەوە بۆی .

وەسفیانی کوڕی عویینە هانی ئەوە دەدات کەپێش ئەوەی کەبانگدەر بانگ بفەرموێت: بچیتە مزگەوت ، دەڵێت: (وەکو بابای خراپەکار مەبە کەنایەتە مزگەوت تاوەکو بانگی نەکرێت ، وەرە بۆ نوێژ پێش ئەوەی بانگ دەر بانگ بدات).

ئەم هەڵوێستەی سفیان بە بەرئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) کەتووەکە دەفەرموێت: « ألا أدلكم على مايمحوا الله به الخطايا ، ويرفع به الدرجات ؟ قالوا: بلى يارسول الله . قال: إسباغ الوضوء على المكاره . وكثرة الخطا إلى المساجد ، وانتظار بعد الصلاة ، فذلكم الرباط ، فذلكم الرباط»[٧] .. واتە: حەزدەکەن شتێکتان پێ بڵێم کە گوناهو تاوانەکان دەشۆرێتەوەو پلەو مەنزڵتان گەورەو بەرزدەبێت ؟ ووتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) . فەرمووی (ﷺ): گرتنی دەست نوێژێکی تەواو لەکاتی ناخۆشیدا (واتە: تۆ کاتی سەرماو ئاوی سارد دەست نوێژ بگریت) وە زۆر هەنگاونان لەبۆ مزگەوت و چاوەڕوانی کردنی نوێژ بۆ نوێژێکی دی تر ، ئەوەش پەیوەستی‌یە .

---

(٥) ئەحمەدو بەیهەقی‌و حاکم دەریان هێناوەو ئەلبانی تەصحیحی کردووە.

(٦) بوخاری‌و موسلیم ریوایەتاین کردووە.

(٧) موسلیم ریوایەتی کردووە.

# ئامەزۆریی نوێژ

پێشینەکانمان لەهاوەڵان بەرزترین و بەهاترین نموونەو هەڵوێستیان بۆ تۆمار کردووین هەتاوەکو لەکاتی نەخۆشی زۆر سەختیش دا ، لەوکاتەی کە عامری کوڕی عبداللە لەسەرەمەرگدابوو خەریك بوو نەفسی خۆی پێش کەش بەخوا دەکردەوە گوێی لەبانگ بوو وەماڵیشی نزیك بەمزگەوت بوو عامر فەرمووی: دەستم بگرن تابچمە مزگەوت و نوێژە کەم بکەم ، پێیان ووت: ئەی عامر تر نەخۆشی فەرمووی: گوێم لەبانگ دەربێ بۆلای خوا بانگم بکات و وەڵامی نەوەمەوە؟!

پاشان دەستیان گرت دەست کرا بەنوێژی مغرب و عامریش لەگەڵیان دا ، عامر تەنها رکاتی یەکەمی کرد لەگەڵیان لەبەر ئەوەی خوای گەورە رۆحی کێشایەوەو مرد .

ئەویش عمری کوڕی خطاب (ﷺ) بەخەبەر دەبێتەوە لەکاتێکا بێ هۆش کەتووە بەوەی کەباسی نوێژ کراوە . سوری کوڕی محزمە (ﷺ) دەیگێڕێتەوە کە عمری کوڕی خطاب کاتێ کە بەشمشێر لێیان دا بێ هۆش بوو ئاگای لەخۆنەما پاشان ووتر: ئێوە ناتوانن بەخەبەری بکەنەوەو بی‌ترسێنن تەنها بەنوێژ نەبێت ئەگەر ژیانی تێدا مابێت . پاشان ووتیان: نوێژی ئەی ئەمیری موسوڵمانان ، نوێژت کرد . پاشان عمر بەمەوە بەئاگا هاتەوەو فەرمووی: ئای خوایە ... نوێژ بەڕاستی هیچ شتێك لەئیسلامدا بۆ کەسێك نی‌یە کەنوێژی وازلێهێنابێت (واتە: ئەوەی کە نوێژ نەکات هیچ شتێکی لەئیسلامەتیدا تیانەماوە) . ئینجا نوێژی کرد برینەکەشی بەگوڕ خوێنی پێدا دەهات . خوای گەورە لێی ڕازی بێت و ڕازی بکات . هاوەڵان دەیان زانی کە نوێژ چەندە بەنرخە و بەهایەکی رەژی هەیە لای عمر لەبەر ئەوە دەیانزانی ئەگەر بەگوێدا

هاوڕێکەیت بڵێی نوێژ ئەگەر ڕۆحی تێدا بێت ئەوا بەئاگادێت ئەگەر لە حاڵەتێکی زۆر بێ ئاگایش دا بێت . بۆیە نوێژیان چرپاند بەگوێیدا کاتێ بێهۆش بوو ڕاستە وخۆ بەئاگاهات .

بەڵام ئێستا تەنها کاتی نوێژکردن خەوشیرین و خۆش دەبێت لای هەندێك موسوڵمان هەندێکمان گوێمان لەبانگ دەرە کاتی خەو بەڵام ناچین بەدەمیەوەو وەڵامی نادەینەوەو بەخەبەر نایەین و لە حەوتەم خەوماندایین وەکو مردوومان لێ دێ ... پەنا بەخوا ...

هەندێکمان کەبانگ دەبیستێ وەك ئەوە وایە کەزۆر نزیك بێت لەمردنەوە بۆیە هەڵناسێت و واجبەکەی بەجێ ناهێنێ بەڵام ئەگەر بڵێین ئەوا دزێك تەنها دزێك هاتووەو ماڵەکەت دەبڕێ تەماشای ئەمانە دەکەیت کەچەند زوو بەخەبەر دێن ڕائەچڵەکێن و بەبازدان لەجێگە دێنەدەر ئەبێ ترسی دزێك زۆرتربێت یان خوای گەورە .

شاعرێك دەڵێت:

*لاتعرضن لذكرنا في ذكرهم          ليس الصحيح إذا مشى كالمقعد*

ناوی ئێمە لەپاڵ ئەواندا مەهێنن ، چونکە نموونەی یەکێك کەدانیشتبووە جیاوازی هەیە لەگەڵ یەکێك کە بەڕێوە بێت و بەرەو ئامانج بچێت .

## براکەم :

ڕەبیعی کوڕی عامر هەڵوێستێکی بڵندی بۆ تۆمار کردووین ، ئەوەتا کاتێك کەپیربووەو هێزی تێدانەماوە بەدووکەس هەڵی دەگرن و بەرەو مزگەوت دەیبەن ، لەم کاتەدا کەبرادەرکانی چاویان پێی دەکەوێت دەڵێن: ئەی ئەبو زید تۆ مۆڵەتت پێدراوە کەنەیەیتە مزگەوت و لەماڵەوە نوێژەکەت بکەیت .

ئەبوزید دەڵێت: بەڵێ دەزانم ڕێگەم پێدراوە بەڵام گوێم لێ بوو وترا: (حی علی الفلاح) وەرن بۆ نەجات بوون و سەرفرازی ، لەبەر ئەوە هاتم ، وەهەر کەسێکتان گوێی لێبوو وا وترا با بەدەمیەوە بێن ئەگەر بەگاگۆڵکێ بووەیان بەخلیسکاندن .[8]

بەڵێ ئەمان شتێك هەبوو کەهانیان بدات بۆ کردنی نوێژو پاراستنی کاتەکانی چێشتنی ناخۆشی ئەویش گوێڕایەڵی خوای گەورەیەو بەگوێ کردنی ئەمرەکانیەتی تەماعی بەهەشتەکەیەتی .

عودی کوڕی حاتم دەڵێت: بەردەوام ئەگەر کاتی نوێژ هاتبێت تامەزۆری بووم کە کەی دێت ، وەهەمووکاتێك ئامادەباش بووم بۆ کردنی نوێژ پێش ئەوەی کاتەکەی بێت .[9]

بەڵێ کاتێك کە دەنگی بانگ بەرز دەبوویەوە خەڵکی بانگ دەکرد بۆ نەجات بون نەفسەکانی دەووروژاندو دڵەکانی ڕاەچڵەکان تەنها ئەوانەش لەوبانگە ڕاستی‌یە تێ‌ئەگەشتن و جۆشیان بۆی دەبوو کە هۆشمەندو بەئاگابوون کەسێکش زیندوو نەبێت گوێ بیستی هەق نابێت و کەڕ دەبێت لەئاستی‌دا کەسانی زیندووش ڕاەچڵەکێن و بەرەو مەنزڵگای پیاوچاکان دەڕۆنو تەنها لەوێ نەبێ ناحەوێنەوە ...[10] وەلەکاتی هاتنی نوێژەکان شادو کامەران دەبوون چونکە لەلای ئەوان نوێژ گفتوگۆ کردن بوو لەگە خودا ئەو نعمەتەی کەخوای گەورە پێی بەخشیون .

ئەبوبکری کوڕی عبداللە مازنی دەڵێت: کێ وەکو تۆیە ئەی ئەوەی ئادەم ؟ لەبەینی تۆو خوادا تەنها میحرابە ، کەی بتەوێ خۆت پاك دەکەیتەوە بەئاوو

---

(٨) حلية الأولياء (١٣٠/٢).

(٩) الزهد – الإمام أحمد (٢٤٩).

(١٠) رهبان الليل (ص: ٣٩).

دەچێتــە نوێــژەوەو گفتوگــۆ لەگــەڵ خــوادا دەکــەیت بــەبێ پــەردە بەبێ وەرگێڕان .[11]

ئەمەش دیاری خوایە بۆ بەندەکانی نیعمەتیێ:ی زۆر زۆر گەورەیە چونکە هەر نوێژ پلەت بەرز دەکات لای خوای گەورەو تاوانەکانشت قەڵەمی لێبووردنی دێت بەسەردا ، پاك و بێگەردی بۆ رەحم و بەخشندەیی پەروەردگار چەند بەرزە بەخشندەیەکەی .

بەڵام ئەفسوس زۆرێك هەن غافڵن لێی و بێ ئاگان لەگەورەیی ئەم نیعمەتە نازانن کە پارەو موڵك و سەرمایەی موسوڵمانان تەنها تەمەنەکەیەتی ئەی چۆن ناپرسن لەفەوتان و بەهەدەرچوونی .. ؟

ئەبوجائی عطاردی دەڵێت: هیچم بەجێ نەهێشتووە یەبلامەوە بەنرخ و بەتیمەت بێت تەنها ئەوە نەبێت کە رۆژی پێنج جار دەموچاوم خۆڵاویی دەکردو دەچوومە سجدەوە بۆ خوای گەورە .[12]

## براکەم :

ئەوان نوێژیان لەشوێن و پلەوپایەی خۆیدا دایان دەناو بەتەوایش بەجێیان دەهێنا ، کردبوویانە پێوەرێك بۆ ناسینی خەڵکی و دەوروبەران . عمری کوڕی خەتتاب دەفەرمووێت: ئەگەر یەکێکت بینی لەنوێژەکانیدا تەمەڵبوو بەفیڕۆی دەدات و نەی ئەکرد بەخودا ئەوە واجبەکانی تر زیاتر بەفیڕۆ دەدات و بەجێیان ناهێنێ .[13]

ئەبو عالیەش هەربەم شێوەیەبوو دەفەرمووێت: ئەرۆشتم تازانیاری لەبارەی یەکێکەوە وەربگرم . ویەکەم شتیش کەپرسیارم لەبارەیەوە دەکرد

---

(١١) البداية والنهاية (٩/٢٥٦) .

(١٢) حلية الأولياء (٢٠/٣٠٦) .

(١٣) تاريخ عمر (ص: ٢٠٤) .

نوێژەکانی بوو ، ئەگەر نوێژەکانی بەتەواوەتی بکردایە ئەوا گوێم بۆ ڕائەگرت و (حدیثی) فەرموودەی پێغەمبەرم لێ وەردەگرت ، چونکە دەمزانی ئەگەر نوێژ بەفیڕۆ بدات و نەیکات ئەوا بۆ غەیری نوێژ خراپترە .

تەنانەت ئەوەندە سووربوون لەسەر ئەم کارە تاکو کەمندالەکانیان لەسەری ڕادەهێناو وەك چۆن پێغەمبەر (ﷺ) پێی ئەفەرموون: « مروا أبنائكم بالصلاة لسبع وضربوهم عليها لعشر وفرقوا بينهم في المضاجع »[١٤] منالەکانتان لە (٧) ساڵیدا فێری نوێژ بکەن وەئەگەر نەیان کرد تا (١٠) ساڵی لێیان بدەن تا ئەیکەن وەلە خەوتنیش دا جیایان بکەنەوە ئافرەتان لەتەمەنی (١٠) ساڵیدا .

زەیدی ئەیامی بە منالانی دەووت: وەرن نوێژبکەن گوێزتان ئەدەمێ پاشان منالان نوێژیان دەکردوو پاشان لەلای کۆدەبوونەوە بەدەوریا دەهاتن ، پێیان ووت: ئەوەچی دەکەیت بەمانە ؟ .. ئەیفەرموو: هیچ تەنها ئەوەنەبێت گوێزیان بۆ ئەکڕم بە یەك درهەم هەتا غێری نوێژ ئەبن و بەردەوام دەبن لەسەری .[١٥]

بەڵام مەخابن ئێستا کەسانێك پەروەردەی منالانیان دەکەن ەشێوەیەکی نادروست دوور لەپەروەردەی ئیسلامی غەمی گەورو بچوکیان خواردن و جل و بەرگەو سەماو یاریە هەموو شێوازەکانییەوە بۆ مندالەکانیان بیریان چووە ئیشی باوکان و ئەرکی سەرشانیان تەنها پەروەردەکردنەکەیە بەشێوازێکی ئیسلامی دروست بەوشێوەیەی کە کاتێك خۆیان ئەمان ترسیان لێی نەبێت و هەڵنەگەڕێتەوە بەڕووی ئەم دینە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ يأيها الذين آمنوا قوا أنفسكم وأهليكم نارا وقودها و الحجلوة ﴾ (التحريم: ٦) .. واتە: خۆتان و ماڵ و منداڵ و کەستان بپارێزن لەو ئاگەری کە سووتەمەنیکەی مرۆڤەکانە .

---

(١٤) ئەبوداودو ئەحمەدو حاکەم دەریان هێناوە وە شێخ ئەلبانی بە فەرموودەیەکی حەسەنی داناوە .
(١٥) حلية الأولياء (٢١/٥) .

# نوێژکردن بەکۆمەڵ

خوای گەورە واجبی کردووە لەسەرمان نوێژ بکەین لەگەڵ کۆمەڵدا واتە نوێژ بەجەماعەت دەفەرمووێت: ﴿واركعوا مع الراكعين﴾ (البقرة: ٤٣) . ركوع بەرن لەگەڵ ئەوانەی کەرکوع دەبن ، واتە هەمووپێکەوە کۆ ، بەهەمان شێوە پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ هاوەڵانیدا بەردەوام نوێژیان بەکۆمەڵ کردووە زۆریش پارستویانە تەنانەت وەکو بەشێکی نوێژی لێهاتبوو لەلایان . وەبەهیچ شێوازێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) وازی لە نوێژکردن بەکۆمەڵ نەهێناوە نەلەشەڕداو نەلەخۆشی‌دا هەتاوەکو لەکاتی نەخۆشی‌یەکەی سەرەمەرگی‌دا ئەرکی نوێژی جەماعەت نەکردووەو وازی لێ نەهێناوە .

بەڵام ئەمڕۆ نابینن لەڕیزەکانی نوێژ لەمزگەوتەکاندا پڕ بێتەوە خەڵکی تەمبەڵی تێدا دەکەن‌و گوێی پێ نادەن نایەنە مزگەوت تا نوێژەکانیان بەکۆمەڵ بکەن ، دەبینن لە نوێژی هەینی‌دا مزگەوت جمەی دێ‌و زۆرێك لە خەڵکی روودەکەن نوێژکردن بەکۆمەڵ بەڵام بەداخەوە تەنها نوێژی هەینی‌یەو پێنج فەرزەکەی تر گوێ‌پێ نادەن ، وا تێ‌دەگەن کە پرسیاریان لێ ناکرێت لەبارەی ئەم بێ ئاگایەیان لەنوێژ کردن بەکۆمەڵ ، یا وادیارە غووریان هەیە بەکۆمەڵ نوێژەکانیان ناکەن ئەی ئەبێ بەچ بیانوێك‌و بەچ عوزرێکلەیەریان لاچوو بێت . گوێ بیستی بانگ دەبن بەڵام گوێ نادەن بەوەی بەرەو بیری برۆن‌و نوێژەکەیان بەکۆمەڵ بکەن .

## برای خۆشەویستم :

ئەبێ زۆر وکری خوای گەورە لەسەر ئەم بانگە بکەین بەرو پیری بڕۆین ، ئاخۆ چەند موسوڵمان هەبێت لەو وڵاتانی تردا تەنانەت گوێ بیستی بانگ

نـابێت ، مەحرومـە لەوبانگـە خوایی‌یـە ، وە ئـای چـەند مردووهەیـە نـاتوانێن وەڵامـی ئـەو بانگەبداتـەوە تەمـەنی بەسـەرچووەو گەڕانـەوەی نی‌یـە وە ئـەوەی چەند نەخۆش هەبێت تامەزرۆی ڕۆشتن بێت بۆ مزگەوت‌و نوێژەکەی بەکۆمەڵ بکات بەڵام مەخابن نەخۆشی‌یەکەی ڕێگرە لێ‌ی و نایەڵێت لەجێگە هەستی .
بەڵێ چونکە بانگی خوایی بانگی یەکتاپەرستی ئاوازێکی گەڵ خۆشی هەیە لەگوێ‌داو خۆشی‌یەکی ئێجگار مەزن دەخاتە دڵی موسوڵمانەوە ... چۆن نا کەئەمە بانگ کردنێکە لەلایەن خوای میهرەبانەوەیە بۆ بەرێ کەوتن لەگەڵ کاروانی پیاوچاکان‌و سوجدەبەران هەر لەبەر ئەمە بوو کاتێك کە ئەبو عمرانی جزنی گوێ‌ی لە بانگ ئەبوو دەست بەجێ ڕەنگی تێك دەچوو چاوەکانی لافاویان دروست دەکرد بابزانین پێغەمبەرەکەمان (ﷺ) چۆن بوو ، عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێت: « پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەناوماندا دەبوو گفتوگۆی لەگەڵدا دەکردین هەر کەکاتی نوێژ ئەهات ئەڵی‌ی هەرئێمەشی نەناسیوەو ئێمەشی ئەومان نەناسیوە » .

وە علی کوڕی حسین (خوای لێ ڕازی بێت) کاتێ دەست نوێژی دەگرت دەموچاوی زەرد دەبوو پێیان دەووت: ئەوە بۆچی لەکاتی دەست نوێژدا ڕەنگت زەرد دەبێت دیفەرموو: « دەزانن من لەبەر دەستی کێدا ڕاوەستاوم » .

جارێکیان سلێمانی کوڕی ئەعمەش لەخەو بەخەبەر هات هەستا لەشەودا بەڵام ئاوی دەست نەکەوت بۆیە دەستی خستە ناو خۆڵەکەوەو تەیەمومی کرد پاشان پرسیاریان لێ کرد بۆچی وای کردووە فەرمووی: ئەترسام بێ دەست نوێژ بمردمایە .[١٦]

---

(١٦) حلیة الأولیاء (٤٩/٥) .

ئەمەش دیارە بەڕێنمونی پێغەمبەرەوە (ﷺ) بووە چونکە دەفەرموویت: ئامۆژگاری هاوەڵەکان دەکات « واعلموا أن خير أعمالكم الصلاة ولا يحافظ على الوضوء إلا مؤمن » (١٧)

کاتێك منصوری کوری زادان هەستا بۆ ئەوەی دەست نوێژ بگرێت کاتێك تەواو بوو لەگرتنی دەست نوێژەکەی و فرمێسك بەچاوەکنیدا هاتەخوار هەتاوەکو دەنگی گریانی لێ بەرز بویەوە پێی وترا: خوا ڕەحمەت پێ بکا بۆچی ئەگریت ؟ چی رویداو ؟ چیتە ؟ . فەرمووی: ئای زۆر گەورە لەسەر ئەستۆم نیازم وایە کەهەستم بەرامبەر یەکێك کە بەهیچ شێوەیەك بێ ئاگا نابێت تەنانەت چرکەیەکیش بەڵام ئەترسم لەوەی ئەترسم کە لێم وەرنەگرێت و قبوڵی نەکات . (١٨)

ئەمەش تەنها لەبەر ئەوەی دڵەکانیان پاك و بێگەردو بوو بەرامبەر بەخوا بەردەوام بەیادی خوا ئارەدان بووبویەوە .

کاتێك بە یزیدی کوری عبدالله وترا: بامزگەوتەکەمان تعمیر بکەین سەقفەکەی باش بکەین یەزید فەرمووی دڵەکانتان باش بکەن مزگەوتەتان باشە . (١٩)

لەبەر ئەوەی هەرکەسێ نیەتی بۆخوا بێت وپێپاکی بکاتەوەو سەیری عەنعفەو نقش ئاکات تەنها خەمی کردنی واجبی نوێژەی دەبێت بەشێوەیەکی شیاو کەخوا دەیەوێت بۆ ئەوەی خوای گەورە لێی وەرگرێت .

(١٧) ئەحمەدو بەیهەقی و حاکم دەریان هێناوەو ئەلبانی تەصحیحی کردووە .
(١٨) صفة الصفوة (٢/٩٣) .
(١٩) حلية الأولياء (٢/٢١٢) .

عدی کوڕی حاتم (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: (لەو ڕۆژەوەی موسوڵمان بووم دەست نوێژم هەبووە پێش ئەوەی بانگ کرا بێت بۆ نوێژ و هەڵسابێتەوە بۆ کردنی .[20]

وە بەهەڵپە بوون لەکاتی وەڵام دانەوەی بانگ دەر هیچ تەمبەڵی و دواکەوتنێك نەبووە لایان ئەوان واتێ ئەگەشتن لەو واجبە کە چی یان بەوە نەبوو لەدنیا وازیان لێ دەهێناو بەرەو لای خوای گەورە دەڕۆشتن .

ئەوا ئیبراهیمی کوڕی میمونی مەروزی کە زەرەنگەر بووە هەرکاتێك بانگی دابێت وازی لەکارەکەی هێناوە ئەگەر چەکوشەکەی لەحاڵەتی بەرزکردنەوە بوبێت بۆ ئیش دای نەئەبەبزاند بەرەو مزگەوت دەکەوتە ڕێ .

ئەوانە پیاوانێك بوون خۆیان یەك لایی کردبووەوە بۆ ئەو کارە بەردەوام بەهەڵپەبوون بۆکردنی فەرمانەکانی خوای گەورەو ڕێنمویەکانی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) . لەوپێناوەدا وازیان لەدنیا دەهێنا بەرەو لای خوای گەورە دەڕۆشتن .

ئەوەندە حریص بوون لەسەر نوێژو طاعات پێشبڕکێیان دەکرد لەوەی کێ زووتر خۆی دەگەیەنێتە مزگەوت .

بەڵام چ چار ... ئێمە پێچەوانەی ئەوانین ئای لەو جوداییەی لەبەینی پیاوانی بەتەقواو گوێ ڕایەڵێ دوێنێ و پیاوانی ئەمڕۆدا زۆربەمان هەرگیز پێش بانگ لەمزگەوت ئامادەنین تەنانەت لەگەڵ بانگیش دا هەندێکیشیان هەر ناچێتە مزگەوت مەگەر بمرێت و ببەنە مزگەوت تانوێژی لەسەر بکەن .

---

(٢٠) السیر (٣/٦٠) .

ئەو گرنگیدانەی کەبەنوێژیان دەدا لەوەدا ڕەنگ دەداتەوە کەچەند زوو لەمزگەوت ئامادە دەبوون و بەردەوام تامەزرۆیی و تەماعی ڕیزی یەکەمیان هەبوو چونکە پێغەمبەرا (ﷺ) ڕێنمونی کردبوون بەوەی کەدەفەرمووێت: « لو يعلم الناس مافي النداء و الصف الأول ثم لايجدوا إلا أن يستهموا عليه لاستهموا عليه » . [٢١]

ئەگەر خەڵکی بەپاداشتی وەڵامی بانگ و ریزی یەکەمیان دەزانی ئەوا بەپەلە پروسکی بۆی دەهاتن چونکە لەوە باشتریان دەست نەئەکەوت پێشە کانمان زۆر ئەم خێرەیان دەپاراست بشری کوری حەسن کە نازناوی (الصفی)یان لێ نابوو لەبەر ئەوەی بۆماوەی (٥٠) ساڵ لەبەصرە بەبەردەوامی لەرێزی یەکەم دا نوێژی بەجێ دەهێنا .

مەگەر تەنها باس ئەوەبکەیت کە چەند بەپەرۆشی (الله اکبر)ی دەست پێ کردنی نوێژبوون کەئێستا زۆربەی خەڵکی لێی مەحرومن و پشت گوێیان خستوەو .

سعیدی کوری مسیب دەفەرموێت: بۆماوەی (٥٠) ساڵ نوێژم کردووە لەگەڵ (الله اکبر)ی یەکەم (دەست پی کردنی نوێژ)وە قولەپێی کەسم نەبینیوە لە نوێژدا مادەی (٥٠) ساڵ واتە لەرێزی یەکەم دا بووە . [٢٢] ﴿ وفي ذلك فليتنافس المتنافسون ﴾ . بابۆ ئەمە پێشبرکێ بکەن .

بەراستی ئەمە پلەیەکە شایستەی پێشبرکێیە . ئاسۆیەکە شایەنی هەوڵدانە ئومێدیکە بۆ تێکۆشەرەکان .

---

(٢١) بوخاری و موسلیم ریوایەتیان کردووە .
(٢٢) وفيات الأعيان (٢/٣٧٥) و حلية الأولياء (٢/١٦٣) .

وە ئەوانەی بۆ دنیاو ئەوەی تێدایە هەوڵ دەدەن پێشبڕکێ لەسەر دەکەن چەندە ئەوشتە بەرزوگەورە بێت بچوکەو هیچ چونکە تەواو دەبێت و بەردەوام نییە . لەبەر ئەوەی دنیا لەلای خوای گەورە نرخی مێشولەیەکی نییە ، بەڵام خوای گەورە نرخی بە گرانەبەها داناوە بۆ بەندەکەی هەر ئەمەشە کەشایستەی هەوڵ و تێکۆشان و پێش برکێیە تێیدا . [٢٣]

سلێمانی کوڕی مهران ماوەی (٧٠) ساڵ لە (الله اکبر)ی دەست پێ کردنی نوێژ ئامادەی هەبووە . خوای گەورە رەحم بەئێمە بکات . [٢٤]

هەندێکمان تەنانەت لەماوەی ساڵێکدا تەنها ئەگەر جارێك یان دووان لەگەڵ (االله اکبری) مامۆستا ئامادەیی هەبێت وە ئەگەر لەنوێژەکاندا تێبینی بکەین و دیقەت بدەین دەبینین کاتێ مامۆستا سەلام دەداتەوە بڕۆێکی کەم لەگەڵیدا سەلام دەدەنەوەو ئەوانی دیکەش هەڵدەستنەوە بۆ تەواو کردنی نوێژەکانیان .

ئێمە لەکوێ ؟ هاوەڵان لەکوێ !

اسیدی کوڕی جعفر دەڵێت: هیچ کاتێك نەم بیستووە مام بشری کوڕی منصور لەگەل (الله اکبر) مامۆستا نوێژی نەکردبێ و هەموو کاتێکیش ئەگەر یەکێك لە مزگەوت داوای خێری لێ بکردایە ئەوا بەبێ وەستان پێی دەبەخشی . [٢٥]

وەکیعی کوڕی جراح دەڵێت: ئەعمەش لە تەمەنی (٧٠) ساڵی بوو تەنها نوێژێکیش دوانەکەتبوو لە (الله اکبر)ی مامۆستا بۆ دەست پێکردنی نوێژ . [٢٦]

---

(٢٣) في ظلال القرآن (٢/٣٨٦٠) .
(٢٤) تذکرة الحفاظ (١/١٥٤) .
(٢٥) صفة الصفوة (٣/٣٧٦) .
(٢٦) تذکرة الحفاظ (١/١٥٤) و صفة الصفوة (٣/١١٧) و السیر (٦/٢٢٨) .

بەلاّم هەندێك لەهاوەلاّن جاریوا هەبوو لەماوەی (٤٠) سالّدا تەنها ئەگەر یەکجار دوابکەوتایە لە (الله الکبر)ی مامۆستا .

ئیبن سماعە دەلّێت: ماوەی (٤٠) سالّ لە (الله اکبر)ی نوێژ دوانەکەتم تەنها ئەو رۆژە نەبێت کە دایکم مرد . [٢٧] ئەگەر ئەوان ئەوەندە جەختیان لەم کارە کردبێتەوە ئەوا بەلاتەوە سەریر نەبێت کەئەگەر ئیبراهیمی نخعی بلّێت: ئەگەر بینیتان کەسێك تەمبەلّی ئەکرد لەوەی ئامادەبێت لەکاتی (الله اکبر)ی دەست پێ کردنی نوێژا ، ئەوا دەستت لێ ی بشۆ . [٢٨]

بەهەمان شێوە ئیبراهیم تمیمی هەمان وتە دەلّێتەوە . [٢٩]

هاوەلاّن خوایان لێ رازی بێت درەکیان بەگەورەیی ئەم کارە کردووە بۆیە ئەوەندە گرنگی‌یان پێداوە سفیانی ثوری دەلّێت: رێزگرتن‌و بەگەورە زانینی نوێژ هاتن‌و ئامادەبوونە لەگەلّ (الله اکبر)ی مامۆستا بۆ دەست پێ کردن نوێژ . [٣٠]

هەر لەبەر دنیایە فریای جەماعەتەکەمان ناکەوین بابزانین مەیمون چی دەلّێت کاتێك ئەیەوێت بچێت بۆ نوێژ پێ ی دەلّێن: کەخەلّکی نوێژیان کردووەو جەماعەت کۆتایی پێهاتووە: دەلّێت: ﴿إنا لله وإنا إليـــه راجعــون﴾ بەڕاستی پاداشتی ئەم نوێژەو خێرەکەی لام خۆشەویسترە لەوەی کە ببمە والی عێراق . [٣١]

بەلاّم ئێمە زۆر جار لەبەر شتێکی‌زۆر هیچ‌و بێ نرخ یان لەبەر کارێکی کەم لەکاری دنیایی مەشغولّ دەبین‌و ناچین بۆ جەماعەت جا ئەگەر ئەوکارە ئەوەبێت کەببێتە والی عێراق ؟ !! دووری‌نی‌یە ئەگەر ولزی لێ نەهێنین .

---

(٢٧) السیر (١٠/٦٤٦) .

(٢٨) السیر (٥/٦٥) و صفة الصفوة (٣/٨٨) .

(٢٩) السیر (٥/٦٢) .

(٣٠) صفة الصفوة (٢/٢٣٥) .

(٣١) مکاشفه القلوب (ص: ٣٦٤) .

عبداللە ی کوڕی عمر ئەگەر فریای نوێژی عیشای نەکەوتایە بەجەماعەت ئەوا ئەو شەوەی بەشەو نوێژ بەسەر دەبرد .

برای خۆشەویستم: نوێژی جەماعەت لەلای ئەو پیاوانە مەنزڵگاو جێ نزرگای گەورەی هەبووە لەدڵیان‌و بەفیڕۆ چوونیشی وەك لەدەست دانی ئازیزێك وابووە لایان . ئەمەش لەبەر گەورەیی خودی ئەم چاکەیەیە وەزانینیان بەگەورەیی‌یەکەی .

حاتم دەڵێت: جارێکیان فریانەکەوتم کە نوێژ بەجەماعەت بکەم تەنها ئەبو ئیسحاق البازی هات بۆ لام سەرەخۆشی لێ کردم ، بەڵام ئەگەر کوڕێکم بمردایە ئەوانە (١٠) هەزارکەس سەرەخۆشی لێ بکردمایە چونکە ئێستا لای خەڵکی مصیبەتی دین بەلایانەوە سووکە لەچاو موصیبەتی دنیا . [٣٢]

ئەمەیە قسەی گرانبەها چەندە دەبنین کە سەرەخۆشیمان لێ دەکەن ئەگەر توشی بەڵایەکی دنیایی بین‌و یەکێکمان کۆچی دوایی بکات بەڵام نابینین کە کەس سەرە خۆشی بکات کاتێك بەشێك لەدین دەفەوتێ‌و بەفیڕۆ دەچێ ... خوای پەروەردگار مصیبەت‌و بەڵاکەمان لەدینەکەمان نەبێت‌و دنیاش نەکەیتە هەر ئومێدی گەورەمان ؟ .

یونسی کوڕی عبداللە دەڵێت: ئەوەچی‌یە بۆچی کاتێك کەمریشکێکم دەڕوات‌و لەدەستم دەردەچێ خەڵکی سەرەخۆشیم لێ دەکەن‌و کەچی کەنوێژم دەچێت کەس نابینم سەرە خۆشیم لێ بکەن . [٣٣]

ئاخۆ چەند هەبێت گیروگرفت‌و خەمەکانی کاری ڕۆژانەی بۆ دەست کەوتنی سودێکی دنیایی یاخود بەرزبوونەوەی مووچەی مانگانەی

---

(٣٢) مكاشفة القلوب (ص: ٣٦٤) .

(٣٣) حلية الأولياء (٣/١٩) و صفة والصفوة (٢/ ٣٠٧) .

هەموو شتێکی بیربەرێتەوە تەنها خەمی دنیاکەیەتی ، ئەی کەی بەخەبەردێت و هەست سوکی ئەم کارەی دەکات ؛ شەوانیش بەخەم و لێکدانەوەیماڵەکەیەتی ئەیباتە حاڵەتێکی داوە کەشەویش خەوی کەم دەبێت بەرۆژیش دیارە ئەوەندە ماندوو دەبێت کە ناپەرژێتە سەرخۆ هە لەگەڕاندایە لێرەو لەوێ زۆر بەچالاکی حساب بۆ هەموو شتێك دەکات ، چونکە سودی دنیایی تێدایە ، پاشانیش ئەم حاڵەتەی وای لێ دەکات کە نوێژەکانی بەجەماعەت نەکات ، هەندێ بیانوی لەمێشکی خۆی دروست دەکات بۆ پۆزشت هێنانەوە بۆ نەچوونی بۆ جەماعەتەکەی .

## برای ئازیزەکەم :

تۆش لەخەو رادەپەریت بەهەڵپە ، واز لەشیرینی خەو نەرمی و گەرمی جێگاکەت دەهێنیت ... لەدوای بانگدەر وەڵام دەدەیتەوە . چی دەڵێت: دەیڵێیتەوە بەرەو مزگەوت و جەماعەت دەکەویتەڕێ بەهێمنی بەهەنگاوێکی ئارام ... لەساردیی و تاریکایی بەیانیاندا ...

خوای گەورە پاداشتی چاکت باتەوەو هەنگاوەکانت بەچاکە لەقەڵەم بدات . دەبا مژدەت بدەمێ پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: کە مژدە بدەن لە وتەیەکیدا « بشروا المشائين في الظلم إلى المساجد بالنور التام يوم القيامة »[٣٤] .. واتە: مژدە بدەن بەوکەسانەی کەلەتاریکاییدا هەنگاو هەڵدەنێنەوە بەرەو مزگەوت دەڕۆن بە نورێکی رووناك لەرۆژی قیامەتدا .

شەیتان زەفەرت پێ نەبات و یەکسەر بەخەبەر وەرە ، هەستەو بەرەو بەهەشتێك بکەوەرە رێ پانتایەیەکەی ئەوەندەی ئەرز و ئاسمانەکانە ، ئەوەی تێیدایە چاوێك نەیبینیوە هیچ گوێیەك نەیبیستوە هیچ دڵێکیش تەنانەت بەخورپەش نەهاتووە بەخەیاڵیدا .

---

(٣٤) ئەبوداودو تورمزی ریوایەتیان کردووە .

خوای گەورە بتگەیەنێتە ئەو مەنزڵگەیەی کەبۆی دەچیت بەهەشتیش بکاتە شوێنت .

## براکەم :

بابزاین پێشینان چۆن بەخەم بوون و عیبادەتەکانیان بەئەرزش دەنرخاند سەرەڕای ئەو هەموو ناخۆشی‌یەی بەسەریانەوە بوو .

ئەبو یوسفی قازی پاش ئەوەی کەکرا بەقازی لەدوای تەواوبوونی دادگەریەکەی (١٠٠) رکعات نوێژی دەکرد .(٣٥)

خەلیفە خارون رەشید دوای ئەوەی کەکرا بەخەلیفە رۆژانە (١٠٠) رکعات نوێژی دەکرد بەبەردەوامی هەتا کۆچی دوایی کرد تەنها مەگەر نەخۆش بوبێت نەیتوانبێ .(٣٦)

بەهەمان شێوە مزگەوت لەلایان زۆر بەنرخ و ئەرزش بوو ، کاتێك عطائی کوڕی یسار دەبینێ پیاوێك لەمزگەوت کڕین و فرۆشتن دەکات بانگی کردوو پێی ووت: ئەمە بازاڕی قیامەتە ئەگەر دنیات دەوێ بڕ دەرەوە بۆ بازاڕەکەی .



(٣٥) تذكرة الحفاظ (٢٩٣/١) .
(٣٦) تاريخ البغداد (٦/١٤) .

## وەستا لەبەردەم خوای گەورە

لەتەواو کەرەکانی نوێژ لەلای هاوەڵان کردنی هەموو واجبو سوننەتو مستحبەکانی بوو بەتەواوەتی بەشێوەکی ترسو زەلیلانە بەرامبەر خوای گەورە وەبەئاگایی دڵەکانیانو بیرکردنەوەیان لەوەی دەیڵێن وەك چۆن خوای گەورە پیایاندا هەڵدەداتو دەفەرمووێت: ﴿الذين هم في صلاتهم خاشعون﴾ (المؤمنون: ٢) .

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: « إن الرجل لينصرف ماكتب له إلا عشر صلاته ، تسعها ، ثمنها ، سدسها ، خمسها ، ربعها ، ثلثها ، نصفها » [٣٧] کاتێك پیاوێك لەنوێژەکەی لێ دەبێتەوە جاریوا هەیە (١٠) پاداشتی نوێژەکە ، یان (٩) ، یان (٨) ، یان (٦) ، یان (٥) ، یان ربعێکی ، یان سێیەکی ، یان نیوەی بۆ نوسراوە لەلای پەروەردگار .

عمری کوڕی خەتتاب (خوای لێ ڕازی بێت) ڕۆژێکیان لسەر مینبەر فەرمووی: پیاو هەردوو قەناڤزی لەئیسلام دا سپی دەبێ بەڵام تەنها نوێژێکی بەتەواوی بۆ خودا ناکات : ووترا ئەوە چۆنە ؟ فەرمووی: ترسانو بەکەم زانینی خودی خۆی تێدانییە ، دڵی نەداوە بەنوێژەکەو هەستی نەکردووە بەرووبەروو بونەوە لەگەڵ خودا . [٣٨]

ئەمە ووتەی عمری کوڕی خەتابە لەسەرەتای ئیسلام دا ئەی ئەبێ حاڵی ئەمڕۆ چۆن بێت ، زۆرێك بێجگە لەوانەی خودا ڕەحمی پێ کردوون ، مەشغەڵەتی دنیامێشکیان قاڵ کردووەو تەنها بیری لەوێدایە . بەڵێ نوێژ

---

(٣٧) ئەبوداودو ئەحمەد دەریان هێناوە وەئەلبانی بەفەردوونەیەکی باشی داناوە .
(٣٨) الأحياء (١٠/٢٠٢) .

دەکات بەلاشەی بەلام فیکری لەناو بازاڕی دنیادا دێت و دەڕوات ئەکڕێ و ئەفرۆشێ زیاد دەکات و کەم دەکات ماڵەکەی ، ئەمەش تەنها لەبێ ئاگایی یەوەیە .

حەسەن دەڵێت: عامری کوڕی عبدی قەیسی گوێ لێ بووە باسی ورنبوویان کردووە لەکاتی نوێژدا ، فەرموویەتی ئەیدۆزنەوە ؟ ووتوویانە: بەڵێ ، ئەویش فەرموویەتی : سوێند بەخوا ئەگەر تیرێکی زۆر فوکە کانیانە لە لاشەم گیر ببێت لام خۆشترە ئەگەر ئەنوێژەکەم دا ئاگام لەنوێژ نەبێت مێشکم بەلای ونبوویەکەوە خەریك بکەم بۆ ئەوەی بیدۆزمەوە .[٣٩]

بەڵێ زۆر راستە بەڕاستی بەجێیەو واقیعیشە بۆکەسێك خوای گەورەی ناسی بێ بەوشێوەیەی کەشیاوێتی بی ناسینی وەنوێژەکەشی بەو شێوەیەبکات کە پێویستە بۆیە حمادی کوڕی سلمە دەڵێت: هەرکاتێك هەستابێتم بۆ نوێژ جەهەنەم لەپێش چاوم دا بووە .[٤٠]

چۆن دەیبینی برای ئازیزم یەکێك نوێژبکات بترسێ لەوەی کەبکەوێتە دۆزەخەوە ؟ ئەوەیە نوێژێك کەترسانی تێدابێت لەخوای گەورەو داواکاریی بێت لەوەی لەلایەتی لەبەهەشت وئەوە نوێژی یەکێکە لەڕێبوارەو ڕێگەئەبڕێ لەدنیاو ئومێدو مەقصەدو مەبەستی کردەوەکانی قیامەتە وەئەوەی تێ یدایە لەخۆشی بەهەشت ... تەنها وەسیەتەکەی (معازی کوڕی جەبەل)ت بەسە کە تۆ تۆبەکەی دەکات و دەڵێت: ڕۆڵەکام ئەگەر نوێژت کرد نوێژی ڕێبوارێك بکە کەبەرەو قیامەت بڕۆیت ، وەواگومان بەرەکە بەهیچ شێوەیەك ناگەڕێیتەوە بۆ دنیا ، وەبزانە ئەی کوڕم کە مرۆڤ لەنێوان دووچاکەدا دەمرێ چاکەیەك کردویەتی و پێشی خستووەو چاکەیەکیش هێشتا نەی کردووە .[٤١]

---

(٣٩) الزهد – لإمام احمد (ص: ٣٢١) .
(٤٠) تذكرة الحفاظ (١/٢١٩) ، شذارت الذهب (١/٢٦٣) .
(٤١) صفة الصلوة (١/٤٩٦) .

ئەگەر هەریەکێك لەئێمە بەم شێوەیە نوێژەکەی ئەنجام بدات ئەوا رەزامەندی خودای تێدا بەجێیە .

با بزانین ئەبوبەکری مزنی چۆن وەسیەتمان بۆ دەکات بۆ هاندانمان و کردنی نوێژەکانمان بەشێوەیەکی شیاوو دروست ، دەڵێت: ئەگەر ئەتەوێ نوێژەکەت سودت پێ بگەیەنێت بڵێ: ئەخیر نوێژە کە ئەیکەم ؟ واتە: وامەست بکە کەپاش نوێژەکە رۆحت دەردەچێت و ئەمری .[٤٢]

ئەگەر بەم شێوەیە نوێژەکانمان ئەنجام بدەین دڵنیابە حاڵمان باشتر دەبێت و ئیشەکانمان خێراتربەڕێوە دەچێت و کارەکانمان ئاسان دەبێت و نوێژەکانمان رێك و پێك و رەوان دەبێت . چونکە نوێژ توێشووی موسوڵمانە لەکاروان و سەفەرکەیدا کەلە دنیاوە دەیکات بۆ قیامەت وەیەکەم شتە کەپرسیاری لێ دەکرێت لەبارەیەوە لەناو گۆڕدا .

سفیانی ثوری دەڵێت: ئەگەر منصوری کوڕی معتمر ببینیایە کاتێ نوێژی دەکرد دەتوون کە هەرئێستا دەمرێ .[٤٣]

ئەمەش هەمووی بەهۆی زۆر گرنگی و خەمخۆری و پاراستنیان بووە بۆ نوێژەکانیان وەبەشێوازێکی کامڵی ئەنجامیان داوە وەهەر کەسێکیش بەم شێوازە نوێژەکانی ئەنجام بدات ئەبێت کەکۆتا نوێژی بێت و خوای گەورەش بەخێر کۆتایی پێ بهێنێ (إن شاء الله) وەکو چۆن عبدالله کوڕی مەسعود باسی لێوە دەکات: هەتاوەکو لەنوێژەکانت دا بیت ئەوا تۆ لەدەرگای (ملیك)ت داوە ، هەرکەسێکیش لەدەرگای (ملیك) بدات بۆی دەکرێتەوە .[٤٤]

---

(٤٢) جامع العلوم والحكم (ص: ٤٦٦) .

(٤٣) صفة الصفوة .

(٤٤) صفة الصفوة (١/٤١٥) .

لەبەر ئەوەی خوای گەورە بەبەزەیی‌و میهرەبانە بەرامبەر ئەوانەی کەعیبادەتی دکەن‌و ئەمرەکانی بەجێ دەهێنن‌و ئەو کارانەشی کەنەهی لێ کردووە نایکەن .

شبرمە دەڵێت: لەسەفەرێك دا هاوەڵی (کدزا الحارثی)م کرد وە ئەگەر لەهەر شوێنێك لامان بدایە ئەوە بەچاوگوفتاری دەکردوو دەگەڕا هەتاوەکو شوێنێکی چاکی بەرچاو دەکەوت‌و دڵی پێی دەکرایەوە پاشان دەچوو شوێنەکەو نوێژی تێدا دەکرد هەتاوەکو ئەو شوێنەمان بەجێ دەهێشت .[٤٥]

لەبەر ئەوەی دڵی پەیوەست بوو بەعیبادەت وەفرسەتی لەکاتەکانی دەهێناو هەموو کاتەکانی عیبادەت‌و چالاکی بوو . ئەی ئینسان کەی لەتەمەنی‌دا کاتی گاڵتەو گەپ جێگەی دەبێتەوە کاتێك کە هەموو تەمەنی چەندسالێکی دیاری کراوەو بەشی چەند نەفەسێك دەکات کە بەرپرسەلێی وە ئەو رۆژانەی کە بەرپرسیارن لێی وە دەقەبەدەقەی قۆستویانەتەوە بۆ ئەوەی سودێکیان پێ بگەیەنێت لەبەر ئەوە بەعیبادەت و چاکە خوازی چاکە کردن‌و وە بەشێوەیەکی چوست و چالاك بەسەریان بردووە و ئومێدەواری پاداشتێکی هەرگیز نەبڕاوەی گەورەی لەلایەن خواوە هەموو ژیانیان عیبادەت و چاکە خوازی و چاکە کردن و خۆپارستن لەتاوان بووە بۆیە بەعامری کوڕی عبدالله وترا: لەکاتی نوێژدا قەت گفتوگۆ لەگەڵ نەفسی حۆتا دەکەیت ... ؟ ووتی: بەڵێ ؛ وای پێ رادەگەیەنم کە لەبەردەم خوای گەورەدا راوەستاوەو سەرفراز نەبێت لەقیامەتدا .

ئەگەر بنوارین بۆ حاڵی خۆمان بزانین لەنوێژدا چۆن گفتوگۆ لەگەل نەفس دەکەین ؟ نوێژەکانمان پڕە لەخەیاڵ‌و رۆچون تێیدا یەك بەدوایەك دێن ئەوەندە زۆرن هەموو کاتێ نوێژەکە داگیردەکەن . وەکو ئەوەی نوێژە بۆ خەیاڵ و گێرانەوەی رووداوەکان بێت لەمێشکدا ، کڕین‌و فرۆشتن لەنوێژە زۆردەبێت

---

(٤٥) صفة الصفوة (١٢٠/٣) .

تەنـــها خـــەياڵمان لايـــەتی چـــەندە زەرەرو چـــەندە قازانجمـــان كـــردووە لەكاسبی‌يەكەمان وەهەندێكمان سەفەرێكی دوورو درێژ دەكەين‌و دەگەڕێينەوە هاوكات لەبەردەم خودادا وەستاوين ئەگەر ئەو وەستانە لەبەردەم كارگێڕێك يا كاربەدەستێكی دنيايی بوايە دەبينـی چـەندە بـەووردی و بەديقـەت دەبـوو لەوتـەكانيدا تەنانـەت حسـابی بۆهـەموو حـەرفێك دەكـرد كـە لـەزاری يـەوە دێتـەدەر بەدڵنيايشـەوە هيچ لـەبير نەئەچوو كەمەبەسـتی بـێ بـەڵام لـەونوێژدا كەس نابينێ بەتەواوەتی ئاگای لەخۆی بێت كاتی نوێژ بەئەنجام دەگەيەنێت نوێژەكەی پڕ دەبێت لەخـەياڵ‌و بيركردنـەوە لەشـتی تـر مەگـەر ئەوانـەی خـوا رەحمی پێ كردوون ئاگايان لەلای خۆيانە ئەوانيش كەمن زۆر زۆر .

## بـراكـەم :

كاتێ مرۆڤ بەيانی دەكاتەوە يان ئێوارە دەكاتـەوە ئەگـەر هيچ غـەمێكی نەبێ تەنها خوای گەورەو يادكردنی نەبێت بەدڵنيايی‌يەوە خوای گەورە هەموو پێداويستی‌يەكانی بۆدابين دەكات . وەهەموو خـەمێكی دنيايی دەڕوێنێتـەوە ، وەدڵی تەرخان دەكات بۆ خۆشەويستی خۆی ، وزمـانی بـەوێر دەبێت بۆيـادی خـۆی وەئەندامـەكانی لەشـی لـەعيبادەت‌و طاعـات‌و چاكـەكردندا دەبێـت . وەئەگەر بەيانی بكاتەوەو شەڕی بەسەربێت خـەمی گـەورەو بچوكـی دنيا بێت خوای گەورە هيچ شتێكی لەسەر سووك ناكات‌و هيچ غەمێك يان ناخۆشی يان موشكلەيەكی بۆ چارەسەر ناكات هەموو ئەداتەوە دەستی خۆی چاكيـان بكات ، ئەوكاتـەدڵی خـەريك خۆشەويستی خەڵكی‌يە بێجگە لەخۆشەويسـتی خـوا ، وەزمـانی وێسـتگەی بـاس كردنـی خـەڵكی دەبێـت جگـە لـەخوا وەبـەردەوام لەخزمەتكردنی خەڵكی هەڵدەسوڕێ و ئيشی ئەوان بەجێ دەكات وەك حـەيوان لەخزمەتكردنی غەيری خۆی دەبێت .[٤٦]

عبدالرحمن ئەيدی دەڵێ: ووتم بە سعيدی كوڕی عبدالعزيز: ئەو گريانە چی‌يە لەكاتی نوێژدا تووشت دەبێ ؟ ووتی: برام پرسيارت كرد وەڵامت بۆی

---

(٤٦) الفوائد (ص: ١١٠) .

چی‌یە ؟ عبدالرحمن دەڵێ: ووتی: ووتومە بەشکو خوای گەورە سودێکم پێ بگەیەنێت لێیەوە ؟ ووتی: (واتە سعید): هەرکاتێ هەستابێتم بۆ نوێژ جەمەتم لەبەر چاوم دا بووە بۆیە دەگریم .[47]

هەر لەبەر ئەمەش بوو کە عاصمی کوڕی ئەبی الجود ئەگەر نوێژی بکردایە وەکو دارێکی لێ دەهات ، وە لەنوێژی جومعەدا لەمزگەوت دەمایەوە تانوێژی عەسر ، پیاوێکی زۆر لەخواترس‌و چاکە کاربوو ، بەردەوام لەنوێژدا بوو ئەگەر کارێکی ببوایەو بەلای مزگەوت دا تێپەڕ بوایە دەیفەرموو: بابڕۆین نوێژێك بکەین چونکە نوێژەکە بەسەردەچێ بەڵام کارەکەمان لەبەردەستەو ناڕوات پاشان دەچوو نوێژێکی دەکرد .

ئا بەو شێوازە مرد (رەحمەتی خوای لێ بێت) بەڵام ئێمە بەردەوام دێین‌و دەچین بەدوای پێداویستی‌یەکانمان پێداویستی مرۆڤیش بەردەوام لەزۆربوون‌و تەواو بونیان بۆ نی‌یە ئەشمرین هەموو شتێك نادێنێت بۆمان مەگەر کردەوەی چاکە نەبێت تەنانەت لەسەر مەرگیشدا بەدوای دنیاو باشمادەکانی دەگەڕێین ، بەڵام تەنهاو تەنهاش هەرکردەوەی چاکە دەمێنێتەوەو دەبێتە خزنەیەك بۆ رۆژی دوایی قاسم کوڕی محمد دەڵێ: بەیانیەکیان هاتمە دەرێ وەهەموو جارێك بەیانیان کەدەهاتمە دەرێ یەکەم کەس لام لێ دەکرد حەزرەتی عائیشە بوو (خوای لێ رازی بێت) بەیانیەکیان دینیم نوێژی چیشتەنگاو (ضحی)ی دەکردو قورئانی دەخوێندو دەیوت ﴿فمن الله علينا ووقانا عذاب السموم﴾ (الطور: ٢٧).. واتە: خوای گەورە رەحمەتی خۆیمان بدا بەسەردا و لەسزای سموم رزگارمان بکات دەگریاو دەپاڕیەوە دووبارەو سێبارەی دەکردەوە منیش بێ‌تاقەت بووم هەستام ئەو هەر وەکو خۆی‌مایەوە ، ووتم ئەڕۆم بۆ بازاڕ ئیشەکانم دەکەمو دەگەڕێمەوە رۆیشتم‌و هاتمەوە سەیرم کرد ئەو هەروەستاوەو ئایەتەکە دووبارەو سێبارە دەکاتەوەو دەگرێت‌و دەپاڕێتەوە .[48]

---

(٤٧) السير (٢/٢٥٩) .

(٤٨) الأحياء (٤/٤٣٦) .

# نوێژی چێشتەنگاو

ئەم نوێژە رەشایی‌یەکی زۆر لەموسوڵمانان بێ ئاگان لێی ، تەنها کۆمەڵێکی کەم نەبێت کەبەجێی دەهێنن ، سەرەرای ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) وەسیەتی بۆ ئەبو هورەیرەی کردووە (خوای لێ رازی بێت) دەفەرمووێت: « اوصاني خليل رسول الله (ﷺ) بثلاث: صيام ثلاثة ايم من كل شهر ، وركعتي الضحى ، وان اوتر قبل ان انام » [٤٩] .. واتە: خۆشەویستەکەم پێغەمبەر (ﷺ) وەسیەتی کردم بەسێ کردوە کەبیکەم: سێ رۆژ رۆژووگرتن لەهەموو مانگێك ، دووركاتی نوێژی چێشتەنگاو ، وەنوێژی تاکی پێش خەوتن (وتر) .

بەڵام ئەمر ئەوانەشی کە نوێژ بەیانی دەکە لەکاتی خۆیدا لەرماوە دوورودرێژەی پاش نوێژی بەیانی هیچ زیکرێکی خودا ناکەن هەتاوەکو نوێژی نیوەرۆ مەگەر کەمێك ، هەرچەندە کاتێکی زۆرەو بەنرخیشە بەڵام مرۆڤ خەریك دەبێت بەدنیاوەو ئاگای لەقیامەت نامێنێ .



(٤٩) بوخاری‌و موسلیم ریوایەتیان کردووە .

# ترسانی پێشینان

خۆشەویستی نوێژو گورجوگۆڵـی تێداوە بەجێ هێنانی بەشێوەیەکی تـەواو لەهەموورویەکـەوە بـەدڵو بەلـەش . تەنـها ئەمـە بەڵگـەی بـڕی خۆشەویستی خودایە لـەنێودڵداو تامـەزرۆیی‌و خۆشـی بـۆ دیـداری ، بـەڵام تەمـەڵی‌و تـەوەزەلی لـەکردنی داو کردنـی بەتاك و لەشوێنی تردا یان بەکۆمـەڵ کۆمـەڵ لەگەڵ موسوڵمان لەغەیری مزگەوت بـەبێ عزر بەڵگەی چۆڵـەوانی دڵـە لەخۆشەویستی خـوداو بـەبێ نرخ و سەیرکردنی ئەوەی کەلایـەتی لەپاداشـت یان بەکەم زانینی جەهەنەمو و چاونەترسی لێی .[٥٠]

با چاوێك بخشێنینەوە بەمێژوودا ئاگاداریی هاوەڵان‌و تابعین بین تاوەکو بزانین ئەوان چۆن بوون‌و ترسانیان چۆن بووە .

(مەیمونی کوڕی حەییان) وەه دەڵێت: مسلمی کوڕی یسار کاتێ نوێژی ئـەکرد بەشێوەیەك بـوو کەسـەرنجی ڕائەکێشا نەپەلـەو نـەزۆردوورو درێـژ ، جارێکیـان نوێـژی دەکـرد لەمزگـەوت دیـواری مزگەوتەکـە ڕووخـاو دەنگێکـی گـەورەی لێ بەرزبویـەوە خـەڵکی ناوبـازاڕ هـاتن بـۆ مزگـەوت بـەرەو دەنگەکـە سەیریان کرد دیواری مزگەوت ڕوخاوەو موسلیم بەبێ ئەوەی تەنها ئاوڕیش باتەوە بۆ دەنگەکە بەردەوام بوو لەنوێژەکەی خۆی .[٥١]

کاتێك پرسیاریان لە خلەفی کوڕی ئەیوب کرد: ئایا مێش ئـازارت پـێ ناگەیـەنێت لـەنوێژدا هاتـاوەکو دەری بکـەیت: فـەرمووی: شـتێك ناکـەم کەنوێژەکـەم لێ تێك بدات ، واتـە (مێشکە هەڵنافڕێنم) پاشـان پێیـان فـەرموو:

---

(٥٠) تاريخ بغداد (٢١٨/١٢) .

(٥١) الزهد - لإمام احمد (ص: ٣٥٩) .

ئەی چۆن ئارام دەبێت لەسەر ئەوە ، فەرمووی: پێم ڕاگەیەنراوە کە فاسقەکان لەژێر قامچی کاربەدەستان ئارام دەگرن بۆ ئەوەی پێیان بڵێن بەئارامیو شانازی پێوەبکەن ئێستا من لەبەردەم خوای گەورە ڕاوەستام پۆن ئەجوڵێمەوە بۆ مێشێك کەدەری بکەم .[٥٢]

وعبداللە کوری زید ئەگەر هەستایە بۆ نوێژ وەکو کۆتەرە دارێکی لێ دەهات لەترسان .. وە بەئەبو حەنیفەیان دەووت (خوای لێ ڕازی بێت): کۆڵەکە ، ئەوەندە دەوەستا لە نوێژەکەیدا بەبێ جوڵە .[٥٣]

وە بەردەوام لەنوێدژو عیبادەت دا بوون عبداللەی کوری سلیمانی کورەزای عبداللەی کوری وەزیر دەڵێت: باپیرمان دوو بەرماڵی بەکاردەهێنا لەزۆریی بەکارهێناندا دڕاندنی پاشان سێ‌هەمیان لەشوێنی ئەژنۆکانیو سجدەدا شاش ببونەوەوخەریك بوو دەدەڕان لەزۆری نوێژ کردن تێیدا هەموو ڕۆژێکیش مەرێکی دەکرد بەخێر ...

وەهیچ شتێك غافڵی نەدەکردن لەنوێژ ، وەهیچ شتێك نەدەبووە ڕێگری لەبەینی ئەوان و خوادا بەردەوامیش ئاگاداری دڵەکانیان دەکرد کە ترسی خوای تێدا بێت لەنوێژەکانیاندا .

ڕۆژێکیان ئەبو عبداللەی نیاصی پێش نوێژی بۆ خەڵکی طرطوس کرد ، پاشان بانگ کرا جیهادە وەرن بۆی ، بەڵام ئەم نوێژەکەی درێژەە پێداو گوێی نەدایە پاشان کەتەواو بوو پێیان ووت: ئەبو عبداللە تۆ جاسوسی ، ووتی بۆ ؟ ووتیان: هاوار کرا بۆ جیهاد تۆنوێژەکەت بەخێرانەکرد تاوەلامی بدەینەوە وبچین بەدەمی هاوارەکەوە . ووتی: هەستم نەئەکر ئەگەر یەکێك لەنوێژدا بێت گوێی لەهیچ بێت غەیری ئەوەی کە لەگەڵ خودا گفتوگۆی پێ دەکات .[٥٤]

---

(٥٢) الأحياء (١١/١٧٩) .

(٥٣) السير (٦/٤٠٠) .

(٥٤) صفة الصفوة (٤/٢٧٩) .

ئیبن و رەجەب دەڵێت لەکتێبەکەی (لطائف المعارف): کاتێ گوێ بیستی ئەم ئایەتە بوون ﴿فاستبقوا الخيرات﴾ و ﴿وسابقوا إلى مغفرة من ربكم وجنة عرضها كعرض السماء والأرض﴾ بەمەنیە بوون کەهەرکەسێکیان پێشی ئەوی تر بداتەوە ئەو براوەبێت لای خوای گەورە . لەبەرئەوە ئەگەر یەکێکی تری بدیایە کەخێرێك دەکات و ئەم ناتوانێت بیکات ئەوا زۆر خەفەتی ئەخوارد ، چونکە لەوە دەترساکە ئەوکەسەی خێرەکەی کردووە پێشی ئەم بکەوێت لەلای خوای گەورەی ، پێشبڕکێکەیان بۆ قیامەت بوو پلەوپایە لای خوای پەروەردگار نەوەك ئەوانەی دوای ئەوان کەپێشبڕکێ کەیان لەسەر ماڵی دنیاو کۆکردنەوەی و دەوڵەمەندی بێت ...

ئەبو طلحە (خوای لێ ڕازی بێت) ڕۆژێکیان لەلای دیوارێکەوە نوێژی دەکرد چاوی کەوتە سەردارێك کەهەنگێك لێوەی فڕێ ... ؟ پاشان ڕوداوەکەی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) گێڕایەوە کەچ فیتنەیەکی تووش بووە ، پاشان ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا بیکە بەخێر ئەیدەی بەکێ بیدە .[55]

وە یەهەمان شێوە کابرایەك نوێژی دەکرد لەلای دیوارێك چاوی کەوتە سەردارخورمایەك کەبەرکەی ئەوەندە زۆر بوو دارەکەی شاردبویەوە . پێی موعجەب بوو ، تاوای لێهات نەیزانی چەند رکات نوێژی کردووە ، پاشان ڕوداوەکەی بۆ حەزرەتی عثمان (خوای لێ ڕازی بێت) گێڕایەوە ، فەرمووی: بیکەبەخێر پاشان بۆ حەزرەتی عثمان فرۆشتی بە (٥٠) هەزار درهەم .[56]

دیارە دەرکیان بەگرنگی نوێژ کردووە بۆیە خشیویانە لەرێی خوادا .

بزانە کەئێمەش ئەم دنیایە بەجێ دەهێڵین لەنێوان (٢) نوێژدایـن نوێژێکیان بەجێمان هێناو ئەوی تر چاوەڕێێن کاتەکەی بێت ، دەبا پێکەوە

---

(٥٥) الأحياء (١٩٤/١) .

(٥٦) الأحياء (١٩٤/١) .

نوێژێك بکەین وابزانین کۆتا نوێژو عیبادەتمانە لەدونیا بەشکو خوای گەورە دوایـن کـاتو پاشـەڕۆژو خاتـەمان بـەوە کۆتـایی پـێ بـهێنێ نوێژەکـەمانو چاکەکانمان وەربگرێتو بەبەزەیی و رەحمەتی خۆیشی لەخراپەکانمان ببورێت .

شەوێك محمدی کوڕی ئیسماعیل (بخاری) نوێژی دەکرد زەردەواڵەیەك (١٧) جار پێوەیدا پاشان کەنوێژەکەی تەواوکرد فەرمووی: ئای سەیرکەن چەندە ئازاری دام . [٥٧]

ئەم ئارامی یەی (بخاری) ترسانە لە ئەنجامی لە گەورەیی خواو ئامادەبوون بەوترسەوە پاڕانەوەڵی وەکو چۆن ئەبونصیری فرادس لە سعیدی کوڕی عبدالعزیز دەگێڕێتەوەو دەڵێت: گوێم لەکەوتنی فرمێسك نەبوو کاتێ کە ئەکەوتە سەرحەسیرەکەی لەکاتی نوێژدا . [٥٨]

بەڵام کاتی کەئاو بەچاومانەوە بەدی ناکەین ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ زبریو رەقـی پێکانمـان مەگـەر لەرەمـەزاندا نـەبێت ئەوانەشـی دڵیـان بـە پەرۆشـەو چاویـان بـە ئـاوە زۆرکـەمن کـە لەترسـی خـوادا لاولزو بـێ بـێهێزو چـاو بەفرمێسکن لەکاتی نوێژەکانیاندا .

هیچ شتێك ڕێگری پیاوچاکانی نەکردووە لەبۆ ماوەیەکی زۆر لەنوێژەکانیان دا لەبەردەم خودا بمێننەوەو درێژەی پێبدەن تەنانەت دەردی پیریش .

ئەبو ئیسحاقی سبیعی دەڵێت: نوێژەکانم وەکو خۆی نەماوە لاواز بووم ئێسکم ناسك بووەو پیربووم ئێستا کەهەڵ دەستم بۆ نوێژە تەنها (البقرة و آل عمران)نم بۆ دەخوێنرێت لەوە زیاتر ناتوانم . [٥٩]

---

(٥٧) السير (٤٤١/٢) .

(٥٨) تذكرة الحفاظ (٢١٩/١) .

(٥٩) صفة الصفوة (١٠٢/٣) .

بەڵام کاتێ کەپەکی کەوتو نەیدەتوانی خۆی هەستێتەوە سەرپێو نوێژەکەی بکات وای لێ هاتبوو کە ئەبو علائی عبدی بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێت: ئەبو ئیسحاق توانای نەئەشکا بەسەر خۆیدا تاهەڵستێتە سەرپێ هەتاوەکو دەستیان دەگرتو هەڵیان دەساند کاتێ کە ئەوەستا بە پێوە (۱۰۰۰)ئایەتی ئەخوێند .[٦٠]

ئیبن جریجی لەباسی عطائی کوڕی رەباحدا دەڵێت: هاوەڵی عطام کرد ماوەی (۱۸) ساڵ ، کاتێك چووە ساڵەوەو پیرکەوتو لاوازبوو کەهەڵئەستا بۆ نوێژ (۲۰۰) ئایەتی لەسوورەتی (البقرة) دەخوێند بەپێوە بەشێوەیەك هیچ جوڵەیەكو هیچ لێتێك چونێکی نەبوو .[٦١]

سێ شتی تیاکۆبویەوە بەتەمەناچوونو لاوازیو درێژکردنەوەی قورئان پاشان ترسێکی کەهیچ جوڵەیەکی تێدا بەدی ناکرێو لێشی‌تێك ناچێت . سەدان رەحمەتی لێ بێت ئاوهایە ترسان لەخوا لەنوێژا.

مساعی کوڕی نباتی مەککی باسی عبداللەی کوڕی زید دەگێڕێتەوە کە بەنوێژدرێژی ناسراوە دەڵی عبدالله یەك رکاتی کرد لەورکاتەدا (البقرة و آل عمران و النساء و المائدة ) تێدا خوێند تەنانەت هیچ نەجوڵا تەنانەت سەریشی بەرزنەکردەوە .[٦٢]

ئەگەر چاوبخشێنینو بزانین چوستو چالاکیان چۆن بووە لەعیبادەت دا با چینە خزمەتی وەلیدی کوڕی علیو ئەو بۆمان باس بکات کەدەڵێ: سویدی کوڕی غفله پێش نوێژی بۆ دەکردین لەمانگی رەمەزاندا لەکاتێك دا تەمەنی (۱۲۰) ساڵ بوو .

---

(٦٠) صفة الصفوة (١٠٥/٣) .

(٦١) السير (٨٧/٥) ، صفة الصفوة (٢١٣/٢) .

(٦٢) البداية والنهاية (٢٥٩/٨) ، صفة الصفوة (٧٦٧/١) .

وە معروف ی کوڕی وصلی تمیمی ئیمامی مزگەوتی (بنی عمر) و (بنی سعد) بوو ، لەماوەی سێ ڕۆژدا خەتمی قورئانی دەکرد ئەگەر لەسەفەریش بوایە ، ماوەی (٦٠) ساڵ پێش نوێژی دەکرد بۆ قەومەکەی یەك جار هەڵەی نەکردووە ، چونکە بەلایەوە زۆر گرنگ و بەهاو نرخ دار بوو .

طەلقەی کوڕی صبیب دەڵێت:حەز دەکەم ئەوەندە ڕاوەستم لەنوێژدا هەتاوەکو پشتم دەکەوێتە ئازار ، کاتێکیش هەڵدەستا بۆ نوێژ لەبدایەتی قورئانەوە دەستی پێ دەکرد هەتاوەکو دەگەیشتە سورەتی (حجر) پاشان دەچووە رکوع .

ثابتی بەنانی دەڵێت: کاتێ کەتێپەڕ دەبووم بەلای عبداللەی کوڕی زبێر دەمبینی نوێژەدەکات وەکو تەختەیەکی جێگیری بێ جوڵە وابوو . [٦٣]

شکاتمان تەنها بۆلای خودایە هاناو پەنامان هەر ئەوە ، ئێستا خێراترین کار کەدەیکەین نوێژە هەندێکمان ئەوەندە بەپەل دەیکات وەکو چۆن مریشکێك دەنووك دەدات لە زەوی بۆدان خواردن بەهەمان شێوە سجدەدەبەن ئەوەندەیە پەلەن هەندێکیشمان ترسانێکی پێویستە تێدا نی یە ، وەزۆرەبەشمان گوێ نادەین بەنوێژو کاتەکانی هەر بەجێی ناهێنین . وەئەگەر بیربکەینەوە لەو ژیانەی کەتێداین و نوێژی تێدا ناکەین دەبینین هەموو هەوڵ و ماندووبوون و هاتوچۆو بەخشین و وەرگرتنمان لەپێناوی چەند دینارێکی زۆر کەمە .

ئای ئەوە چی یە پشتمان کردووەتە نوێژو واجبەکان بەجێ ناهێنین . تەنها لەپێناوی ژیانێکی کەمی بێ نرخ ...

بەڵی عبداللەی کوڕی مسعود ئەگەر نوێژی بکرادایە وات دەزانی جلێکی فرێ دراوە ئەوەندە بێ جوڵەبوو . [٦٤]

---

(٦٣) البداية والنهاية (٣٥٨/٨) .

(٦٤) الزهد للإمام احمد (ص: ٢٣١) .

وەکاتێ سعیدی کوڕی جبیر نوێژی دەکرد شێوازی کۆڵەکەی وەردەگرت .[٦٥]

وەکاتێك کە عبداللەی کوڕی زبیر دەچووە رکوع ئەوەندە بێ جوڵە بوو هەڵۆ لەسەرپشتی دەنیشتەوە ، وەکە دەچووە سجدە شێوازی جلێکی فڕێدراوی وەردەگرت .[٦٦]

ئیبن وەھب دەڵێت: ثوریم بینی لە مزگەوت دا لەدوای نوێژی مغرب پاشان سجدەی برد سەری بەرز نەکردەوە تاوەکو بانگی شێوانی (عیشا)ی‌دا بەڵێ ئەمانە ئالای بەھەشتیان بۆ بەرزکراوەتەوە رێگەیان بۆ روون بوەتەوە خۆشیان بەردەوام لەورێگەدا ئەسپی خۆیان تاوداوەو کاروانیان بەرێ کەتووەوە بەلایانەوە زۆر گێلی بووە شتێك بفرۆشن کەھیچ چاوێك نەیبینیوە ھیچ گوێیەك نەیبستووە ھیچ و دڵێك بەخۆرپەش بەلای‌دا نەچووە . کەئەمشتە ھەرگیز تەواوبونی‌و نەمانی بۆنی‌یە چۆن دەیفرۆشن ژیانێك کەوەتو خەو وایە یاخود دەڵێی تارمایی‌یەکە لەخەودا دەیبینین پڕ لەحرمان‌و تێکەڵاوی بێ‌ئومێدی‌یە نموونەی خواردنێکە لەقورگدا بمێنێتەوە ئایەتە لەرێ واسراحەت بکەیت نەبچێتە معدەوە سوودی لێ وەربگرێت ، بەڵی ئەگەر کەسێك خۆش بێت وسێ پێ‌بکەنێت بەدوایدا گریانێکی زۆرو ناخۆشیەکی گەورەدێت ئەگەر رۆژێکی دڵت خۆش بێت مانگێکی دڵ تەنگیت ، تاڵاوەکانی زۆر زۆرترە لەخۆشی‌یەکانی ، خەمەکان‌و خەفەتەکانی چەندین جارەی رووداوە دڵخۆش کەرەکانە بەڵێ بەترس‌و خەم دەست پێ دەکات کۆتایی‌یەکەیش بەمردن بەرەو گۆڕ دەتبات ئەبێ چی‌بێ .. !

---

(٦٥) صفة الصفوة (٣/ ٧٧) .

(٦٦) البداية والنهاية (٨/٣٥٩) .

ئەبو قطن دەڵێت: هەرکاتێك شعبەی کوڕی حجاج دەبینی دەچووە رکوع ئەموت لەوانەیە بیری چوبێتەوە سەربەرزبکاتەوە وەکە ئەچووە سجدە ئەموت بەدڵنیاییەوە بیرە چووەتەوە سەر بەرزبکاتەوە .[67]

علی کوڕی فضیل دەڵێت: ثوریەم بینی لە سوجدەدا بوو حەوت جار بەدەوری کەعبە سوڕامەوە هێشتا هەر سەری لەسوجدەدا بەرز نەکردبویەوە .[68]

سەرەڕای ئەم بەنرخ زانینەی نوێژو گرنگی پێ‌ی دەبینین ترسی ئەوەیان دەبێت کە نوێژەکەی بەتەواوی نەکردووەو داوا لەخوا دەکەن کە لێیان ببورێ‌و قبوڵی بکات.

عثمانی کوڕی ئەبی هرش دەڵێت: هەر نوێژێکم کردبێ پاڕاومەتەوە لەخوا لێم خۆش بێت لەهەر کەمو کوڕی‌یەك کەهەمبوبێ لەنوێژەکەدا .

کاتێکیش باسی خۆیان‌و نوێژەکانیان دەکرد سەرت سوڕدەما معاویەی کوڕی مرد دەڵێت: (٧٠) صحابەم بەچاو بینیون لەگەڵیاندا ژیاوم ئەگەر بێت ئێستا بمانایە ئەوا نامۆدەبوون بۆ ئەو نیشانەی ئێو دەیکەن مەگەر بەس (بانگ) بناسێنەوە .[69]

میمون کوڕی مهران دەڵێت: ئەگەر یەکێك لەپێشینان ئێستابمایە ئەوا بەس قیبلەکەی دەناسیەوە ئەمەلە قەرنەکانی یەکەمدا بوو ئەبێت ئێستا چۆن بێت .

## براکەم :

دەرکەوتووە بۆ هەموو خاوەن عەقڵێك‌و هۆشمەندێك ئەمڕۆی ئێمەی تێداین گۆڕانی بەسەرداهاتووە ترسان لەخوا نەماوە بڕاوە پاشە ئەوەی

---

(٦٧) تذكرة الحفاظ (١/١٩٢) .

(٦٨) السير (٧/٢٧٧) .

(٦٩) حلية الأولياء (٢/٢١٩) .

کەمزۆربوو لەسەردەمی ئەصحاب دا باوێنە و نموونەیەکی تر ببینین لە چۆنیەتی نوێژ کردنیان حاتم ی کوڕی ئەصم دەڵێ لە بارەی نوێژەکەیەوە : ئەگەر کاتی نوێژ بماتایە دەستنوێژم بە تەواوی هەڵدەگرت ئەهاتمە بەو شوێنەی کە ئەمویست نوێژەکەی تێدا ئەنجام بدەم دادەنیشتم هەتا وەکو هۆشم بەسەر هەموو لاشەو بەدەنمدا زاڵ دەکردوو کۆم دەکردنەوە ، پاشان هەڵدەستام بۆ نوێژ کردن . کەعبەم لەنێوان هەردوو برۆمدا دادەنا ، بەهەشت لەلای لای راست و جەهەنەمیش لە لای چەپ و ملك الموت لە پێشمەوە ، واگومانم دەبرد کە کۆتا نوێژمە هەڵدەستام لە نێوانی ترس و ئومێددا (الله اکبر) راستەقینەی لە نێودڵەوە بەرز دەبوویەوە لێم کە قورئانیشم تێدا دەخوێند بە (ترتیل)و ڕەوانی دەم خوێند ئەچەمامەوە بۆ رکوع زۆر بەسادەوە ساکاری بەبێ (تکبر) خۆ بەزل زاین سجدەم دەبرد بە ترس و زەلیلی یەوە دادەنیشتم لەسەر قاچی چەپم لەتەحیاتدا پشتی پێی چەپم دادەخست تا لەسەر دانیشت پێی ڕاستیشم راست دەکردەوە لەسەر پەنجە گەورە هەڵم دەستاند پاشان زۆربە نیازپاکیو (اخلاصە) بەجێم دەهێنا ، پاشان نازانم ئایا لێم وەرگیراوە یاخود نا .[(٧٠)]

## خەڵکیش لەنوێژدا لەپێنج مرتەبەو پلەدان:

<u>یەکەمیان:</u> ئەو کەسەی کەستەمکارە لەنەفسی خۆی ئەوەیە کە کەمتەرخەمی هەیە لەدەست نوێژو کاتی نوێژو سنورەکانیو رکن و پایەکانی.

<u>دووەمیان:</u> ئەوەیە کە کاتەکەی دەپارێزێو پایەو روکنەکانی بەجێ دەهێنێو روکەش وادیارە دەست نوێژێکی باشی گرتووە بەڵام ئاگاداری نەفسی نییە لەنوێژیەکەدا وەسوەسەی شیطان خەریکی کردووە ، نوێژەکەی تەواوبووە بەوەسوەسەو فیکرکردنەوە لەشتیتر .

---

(٧٠) احیاء (١٧٩/١) .

سێیەمیان: ئەو کەسەیە کەدەست نوێژێکی باشی گرتووەو ڕوکن یەکانی بەجێ هێناوەو بەردەوام لەجیهادا بووە بۆ رەت دانەوەی وەسوەسەی شیطان و بەئاگا بوونی نەفسی و پایەکانی لەنوێژەکەیدا ئەمەش دیارە مەشغوڵ بە جیهادکردن لەگەڵ ئەو دوژمنەی کەدەیەوێ نوێژەکەی بدزێ ئەمەش لەنوێژو جیهاددایە .

چوارەمیان: ئەوکەسیە کە هەڵدەستێت بۆ نوێژ کردن هەمو خەمێکی دەداتێ وپایەو روکنەکانی بەجێ دەهێنێ و لێی بەئاگایە لە روکن و پایەو حەقەکانی نوێژ بۆ ئەوەی هیچ شتێکی بەفیڕۆ نەچێ . هەموو خەمیشی بۆ نوێژەکەیتی کە بەجوانی بیکات و حەقی خۆی بداتێ ئەمەش دڵی مەشغوڵە بەنوێژەکەیەوە بەئاگایەو بەندایەتی خوای گەورەی تێدابەجێ دەهێنێ .

پێنجەمیان: کەسێکە وەکو شێوازی چوارەم بەڵام لەگەڵیدا دڵی خستووەتە بەردەم خوای گەورە . بەدڵ نیگای خوای دەکات و ئاگاداری بێ دەکات ، پڕە لەخۆشەویستی و گەورەیی خودای پەروەردگار وەکو ئەوە وایە کەبیبینێ ونیگای بۆ بکات . هیچ وەساوسێك نەماوە هەموو خویەو گومان فیکرێك قێزەوون بووەو دوورە لێی واهەست دەکات کە پەردەکانی نێوان خۆیی و خودایە هەڵگیراوەو نەماوە نێوانێك ی گەورە لەبەینی ئەو خەڵکی و دنیادا دروست بووە ئەمەش باشترو بەرزترە بەندەترە بەلایەوە لەوەی کەنێوانی زەوی و ئاسماندایە . ئەم کەسەش لەنوێژەکەیدا مەشغوڵە بەخوای گەورەوە دڵخۆش و بەکەیفە بۆی .

کۆمەڵی یەکەم سزادەدرێن و کۆمەڵی دووەم محاسەبە دەکرێن و کۆمەڵی سێهەم دەبێتە هۆی لاچوونی تاوان گوناهەکان و کۆمەڵی چوارەم پاداشتی چاکی هەیە و کۆمەڵی پێنجەمیان نزیکە لەخوای پەروەردگار لەبەر ئەوەی بەشی هەیە چونکە لەوکەسانە کە دڵخۆشیان و کەیفیان لەنوێژەکانیدا هەیە

وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: « حبب إلى من دنياكم الطيب ، والنساء وجعلت قرت عيني في الصلاة »[٧١] دڵخۆشیمو کەیفمو چارگەشیم لە نوێژدایە .

وەبێگومان هەرکەسێك شادمانو بەختەوەربێت بەئەنجام دانی نوێژ ئەوا کەمەرانو شاد دەبێت بەنزیکی لە خوای پەروەردگار وەخوای گەورەش دڵخۆشیو شادمانی دەکات لەدنیاش دا وەهەرکەسێك بەخودای گەورە ئاشنادەبێ وەهەرکەسێکیش خوای گەورەی نەویێتو شادمان خۆش کەیف نەبێت ئەوا دنیا لەلای هەر بەئازارو ئەشکەنجەو ناخۆشی تێپەڕ دەبێت بەسەریدا .[٧٢]

هەندێك لەپێشینان دەڵێن: ئەوەی ئادەم تۆ پێویست بەو بەشەت هەیە کەلەدنیادا بۆت دانراوە می‌تۆیە پێویست تر وگرنگ بەشەکەی قیامەتە ئەگەر تۆ هەموو هەوڵو کۆششت تەنها بۆ بەشەکەی دنیابێت ئەوا بەشی قیامەتت دەدۆڕێنیو تەنها بەشی دنیات دەس ددکەوێت ئەویش زۆر بەزەحمەتو عەزیەت وەئەگەر هەوڵ کۆششت بۆبەبشی قیامەتت بێت ئەوا دڵنیایە دنیات زۆر بۆ ئاسانە ئیشەکانی بەرێكو پێکی بەرێوە دەچێت سەرەڕای بوونت لەهەر دوودنیا .[٧٣]

## براکەم:

بزانەکە ژەنگی دڵ بەهۆی دووهۆکارە: غافڵ بوونو (بێئاگابوون)و تاوان . وەلابردنی ژەنگەکەش هەر بەدووهۆکارە داواکردنی لێخۆش بوونو وێردکردن (ذکر) . وە هەرکەسێك زۆرینەی کاتی بەبێ ئاگایی لەخوا بەسەر برد ئەو ژەنگ ڕپۆشی دڵی دەگرێو چین چین بەرزدەبێتەوەو ئەمەش بەپێی

(٧١) نەسائیو ئەحمەد دەریان هێناوەو ئەلبانی بەفەرموودەیەکی صەحیحی داناوە.
(٧٢) فضائل الذكر لإبن الجوزي (ص: ٢٧) .
(٧٣) فضائل الذكر لإبن الجوزي (ص: ١٩) .

بێ ئاگایەکەیەتی چەندە بێ ئاگا بێت ئەوەندە زۆر دەبێت ژەنگەکە ئەو کاتەش هیچ زانیاری یەك وێنەی نابێت لەنێو دڵەکاندا بەڕوونی شتەکان نابینێ ئەوکاتەش باطل بەحەق دەزانێو حەقیش لەشێوە باطل بەدی دەکات . لەبەر ئەوەی ئەوەندە ژەنگ کۆبۆتەوە لەسەر دڵی تاریك کردووەو هیچ وێنەیەکی راستی لێوە بەدی . ناکەوێت وەکو شێولزی خۆی ، پاشان وورده وورده زیاد دەکات و رەش دەبێتەوە تاوەکو ﴿ران﴾ی لەسەر دروست دەبێت ﴿كلا بل ران علي قولبهم ما كانوا يكسبون ...﴾ یەك پارچە رەشایی دەخولقێنێ پاشان بەەش هەموو بیروبۆچونێك و هەموو درکێکی فاسید دەبێت ، بەم شێوەیەش ئیتر نەهەق وەردەگرێو پێ ڕازی نە ئینکاری باطل دەکات و نەبەخراپیسی دەزانێت ئەمەش گەورەترین سزای دڵەکانە ، هۆی دروست بوونیشی دەگەڕێتەوە بۆ غافڵ بوون و ئاگایی و دواکەوتنی ئارە زوو و هەرەسی چونکە دەبێتە هۆی شاردنەوەو روپۆش کردنی نوری دڵ و چاوەکان کوێردەکەنو دەبنە نابینا . [٧٤]

طەلقی کوڕی حبیب دەڵێت: هەقە کانی خوای گەورە زۆر لەوە زۆرترو گەورە ترە کە مرۆڤ بتوانێ هەستێت بەئەنجام دانی ، بەڵام کاتێ رۆژتان کردەوە بگەڕێنەوە بۆلای خوا تەوبە بکەن کاتێکیش شەوتان کردەوە بەهەمان شێوە بگەڕێتەوە بۆلای خواو داوای تەوبەکردن ولێخۆشبون بکەن . [٧٥]

خۆشەویسمتان پێغەمبەری خوا پێش وەفاتی وەسیەتمان بۆ دەکاو دەفەرمووێت: « الصلاة الصلاة ، وما ملكت أيمانكم » [٧٦] نوێژەکانتان نوێژەکانتان .

دەبا هەمیشە لەوشوێنانەدا بیت کەخواگەورە ئەمری پێ کردووین کەلێی بین دووریش بیت لەو شوێنانەی کە فەرمانی پێ کردووین لێی .

---

(٧٤) فضائل الذكر لإبن الجوزي (ص: ٤٦) .

(٧٥) شرح الصدور (ص: ٢٩٥) .

(٧٦) ئیمام ئەحمەدو ئیبن ماجە ریوایەتیان کردووە ئەلبانی بەفەرموودەیەکی صحیحی داناوە .

# حوکمی نوێژ نەکەر

**براکەم:**

پاش ئەوەی پێکەوە ژیانێکمان بردە بەسەر لەدوورو نزیکی مشتێکی خەروارى هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ)و دواینەکانیان (خوایان لێ ڕازی بێت) کە تەنها یەك کەسیان بگرین نموونەیەکە کەدڵەکان دێنێتە جۆش و چاوەکان پاراو دەکات بەدڵۆپە فرمێسکی ئیمان ئەوکاتە هیمەتمان بەرز دەبنەوە تادەگاتە چلە پۆپەو لەوێوە بەدیدگای لیقای خۆشەویستان دەگەن .

گەڕاین و گەڕانو بەرچاومان دەکەوتن هەموویان هەر لەسجدەو زۆربەیان بەرێوە بوون بۆ وەڵام دانەوەی بانگ بێژ بۆ بەجێ هێنانی نوێژ . پاشا ئەمانە باش وایە کە ئەگەر باسێکی حوکمی نوێژنەکەر بکەین و خۆمان و کەسانی نزیکمان لەو خەتەرەو گوناهە گەورەیە ئاگادار بکەینەوەو بیانگرین و نەیەڵین خۆیان فڕێ بدەنە ناو ئەم ئاگرەی کەسوتەمەنی‌یەکەی بەردور مرۆڤە . لەبەر ئەوە باسێکی وردوو پارا لەم بارەیەوە پێویستە تاواتان لێ بکات بە گوێڕێکی زۆرە بچین و ئەو کەسانە ئاگادار بکیەنەوە کە تەمبەڵی تێدا دەکەن بەجێ ی ناهێنن ئومێدی ئەوەی خوای گەورە دڵەکانیان ڕۆشن بکاتەوەو هەست بەئەنجام دانی .

پرسیاریان لەشێخ محمد کوڕی عثیمین کردووە وویتان:

ئەگەر پیاو فەرمانی کرد بەماڵەوەیان کەنوێژ بەجێ بهێنن بەڵام ئەوان گوێیان بۆڕانەگرت و بەجێیان نەهێنا ، ئایا لەگەڵیان دابنیشێ و نان بخوات و هەڵسوکەوت بکات یاخود بچێتەدەرەوە لەماڵەکە ؟

وەڵام: ئەگەر بێت ماڵەوەیان هەر نوێژ ناکەن نەیانکردووە ئەوان کافرن . ومرتد بونەتەوە ، دەرچوون لەئیسلام ناشبێت پیاوەکە لەگەڵیان نیشتەجێ بێ بەڵام دەبێت بانگیان بکات بەشێوەیەکی جەکیمانەو دووبارەو سێبارەی بکاتەوەو زۆربەجەخت بکات لەسەری بەڵکو خوای گەورە هیدایەتی بداتو چونکە نوێژنەکەر کافرە —پەنا بەخوا— بەبەڵگەی قورئانو سوننەتو ووتەی هاوەڵانو بۆچونی راست .

بەڵگەی قورئان خوای گەورە دەفەرموێت: لەبارەی موشریکەکانەوە: ﴿فان تابوا وأقاموا الصلاة وآتوا الزكاة فاخوانكم في الدين﴾ .. واتە: ئەگەر تەوبەیان کردوو گەڕانەوەو نوێژیان بەجێ هێناو زەکاتیان دا ئەوا براتانن و هاودینشتانن ، بەڵام مەفهومی ئایەتەکە وا هەڵدەگرێت ئەگەر ئەوان ئەمانەیان بەجێ نەهێناو ئەوا براتان نین هیچ کاتێك برایەتی نێوان موسوڵمانان هەڵداگیرێ چەندە ئەوکەسە تاوانێکی گەورد بکات مەگەر ئەنها چوونە دەرەوە لەئیسلام بێت بیبێتە هۆی رێگری برایەتی ئەم ئایەتەش چوونە دەرەوەیە لەئیسلام بۆیە نابنە برامان .

بەڵگەی سوننەتیش فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) « بين الرجل وبين الكفر والشرك ترك الصلاة »[٧٧] واتە: لەنێوان مرۆڤو کوفرو شیرکدا وازلێهێنانی نوێژە .

وەفەرموودەکەی (بريدة)دا (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: « العهد الذي بينا وبينهم الصلاة فمن تركها فقد كفر» ئەو وەعدوپەیمانەی لەنێوان ئێمەو ئەوان دا (واتە کافرەکان) هەیە نوێژە هەرکەسێك بەجێی نەهێنی کافر دەبێت .

---

(٧٧) موسلیم ریوایەتی کردووە .

ووتەی هاوەڵانیش عمری کوڕی خەتتاب دەفەرموویت: « لاحظ في الإسلام لمن ترك الصلاة » هیچ بەشێکی ئیسلامی پێوە نییە هەرکەسێک واز لەنوێژ بهێنێ . (خط) بەمانای (نصیب) دێت واتە (بەش) لێرەشدا (لاحظ) بەنەفی هاتووە خظ تکرەیەکی گشتی‌یە واتە هیچ بەشێکی نەکەم و نە زۆر نی‌یەتی لەئیسلام .

عبداللەی کوڕی شەقیق دەڵێت: هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) هیچ کردەوەیەکیان بەکوفر دانەنەنا تەنها نوێژ نەکردن نەبێت .

*وەك بۆچوونی راستیشە وتراوە: ئایا مەعقولە کەیەکێك بەقەدەر دەنکە خردەلێك ئیمان لەدڵی دا بێت وبزانێت نوێژ چەند گرنگەو بەنرخەو چەندە خوای گەورە جەختی لەسەر دەکات وازی لێ بهێنێ ؟ ئەمە شتێکی نابەجێ‌یەو زۆر وردیش بوومەتوە لەوبەڵگانەی ئەوکەسانەی‌کەدەڵێن: کافر نابێت واش دەبینم کە لەم چوار هۆیە بەدەر نی‌یە:*

١- یا ئەوەتا هیچ دەلیلێکی نی‌یە لەسەری .

٢- یا بەستراوە بەوەسفێکەوە کە ناگونجێت‌و نابێت لەگەڵ نەکردندا .

٣- یاخود بەستراوە بەحاڵەتێکەوە کە ناتوانرێت نوێژی تێدا بکرێت بەهۆی ئەوەی عوزریان هەیە .

٤- یاخود ئەوەتا گشتی‌یەو تەخصیص کراوە بەفەرموودەکانی کەباسی کافربوونی نوێژنەکەر دەکات .

وە ئەگەر روونکرایەوە کە نوێژنەکەر کافرە ئەوا هەموو حوکمەکانی مرتد لەپاشگەزبوەوە لەئیسلام بەسەردا دەدەرێت . وە لەهیچ دەقێکدا نەهاتووە کەنوێژنەکەر ئیمانداره یاخود ئەچێتە بەهەشتەوە یاخود رزگاری دەبێت لەئاگر ... هەرشێوازێکی‌تر لەم باریەوە ... تاوەکو وامان لێبکات کە تأویلی

کفرێك بکەین کە دراوە بەسەر نوێژنەکەرداو پێی بڵێن کە ئەمە کفری نعمەتە یاخود (کفری دون کفره) .

## حوکمەکانیش ئەمانەیە:

**یەکـــەم:** نـابێت ئەگـەر پیـاوبوو ئـافرەتی موسـوڵمانی بدرێتـێ بـە وەکـاتێکیش کـەنیکاحیان کـردو لـە ئـافرەتێکی موسـوڵمان ئەگـەر پیاوەکـە نوێژنەکەر بێت ئەوا نیکاحەکە باطلـە وە ئافرەتەکـەش نابێتـە حـەڵاڵی لەبـەر فەرموودەکەی خوای گەورە لەبارەی ئافرەتە موجاهیدەکان ﴿فان علمتموهـــن مؤمنات فلا ترجعهون إلى الكفار لاهن حل لهم ولاهم حل لهن﴾ (الممتحنة: )

**دووەم:** ئەگەر پیاوەکە نیکاحی بۆکرا لەو ئافرەتە پاشان دوای ئەوە وازی لەنوێژرکردن هێنا ئەوا نکاحەکەی بەتاڵ دەبێتەوە ئافرەتەکەش نابێتە حەڵاڵی لەبـەر ئـەو ئایەتـەی پێشـوو کـەباسمان کـرد بـەپێی ئـەو ووردەکـاریو تەفصیلیە کە زانراوە لەلای زانایان لەنێوان ئەوەی کە دوخلەی پێ کردبێت یاخود نا ...

**سێیەم:** ئەوپیاوەی کەنوێژ ناکات ئەگەر هەرحەیوانێك سەر ببڕێت ئەوا نـابێت بخورێـت چونکـە حەرامـە ، بـەڵام ئەگـەر یهودیـەك یـاخود گـاورێك (مەسحیی) حەیوانێك سەرببڕێت حەڵاڵـە خواردنەکەی بۆ ئێمـە، بـەم شێوەیە پەنا بەخوا سەربڕینەکەی پیستر دەبێت لەسەر بڕینی جولەکەو گاور .

**چوارەم:** بۆ نوێژنەکەر نی یە کەبچێتە ناو مەککەو حەرەمەکانی حەرامە لێی لەبەر فەرموودەی خوای گەورە: ﴿يا أيها الذين آمنوا إنما المشركون نجـس فلا يقربوا المسجد الحرام بعد عامهم هذا﴾ .

**پێنجەم:** ئەگەر هەریەکێك لەخزم نزیکەکانی بمرێ نوێژ نەکەر میراتی پێ ناگات . ئەگەر پیاوێك مرد نوێژکەر بوو کورێکی نوێژنەکـەری هـەبوو وە

ئامۆزایەکی دووری ھەبوو (واتە: راستەوخۆ نەبێت) بەڵام نوێژکەر بێت ؟ کامیان وەرەسەی ئەم پیاوە مردووەیە ؟ دیارە ئامۆزاکەی نەك کوڕەکەی چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەفەرموودەی ئوسامەدا دەفەرمووێت: « لایرث المسلم الکافر و الکافر المسلم » [٧٨] واتە: موسوڵمان نابێتە وەرەسەی کافرو کافریش نابێتە وەرەسەی موسوڵمان . وەفەرموودەیەکی تری پێغەمبەر (ﷺ): « الحقوا الفرائض بأهلها فما بقی فلأولی رجل ذکره » [٧٩] واتە:

<u>شەشەم:</u> نوێژنەکەر ئەگەر بمرێت نابێت بشۆردرێت و کفن بکرێت وەنابێت نوێژی لەسەر بکرێ نابێت لەقەبرسانی موسوڵمانانیش دا بنێژرێت . ئەی چیان لێ بکەین ؟ ئەیبەینە دەشتایەیەك و چاڵێکی بۆ ھەڵدەکەنین و بەجلەکانی خۆیەوە بنێژرێت لەبەرئەوەی حورمەتی نییە لەبەرئەوە نابێت بۆھیچ کەسێك کەیەکێکی لێ بمرێ نوێژ نەکەربێت و بیداتە دەست موسوڵمانا بۆئەوەی نوێژی لەسەر بکەن .

<u>حەوتەم:</u> نوێژنەکەر حەشردەکرێت لەرۆژی قیامەت دا لەگەڵ فیرعەون و ھامان و قارون و ئوبەی کوڕی خەلەف ، ھەموو سەرکردەکانی کوفر –پەنا بەخوا– ناچێتە بەھەشت بۆ ھیچ کەسێکیش نییە لە ئەھلەکەی کەدوعای بۆ بکات کەخوای رەحمی پێ بکات و لێی خۆش بێت . چونکە کافرەو شایەنی نییە لەسەر فەرموودەی خوای گەورە: ﴿ما کان للنبي والذین آمنوا ان یستغفروا للمشرکین ولو کانوا اولی قربی من بعد ماتبین له انهم اصحاب الجحیم﴾ .. واتە: بۆ پێغەمبەرو موسوڵمانان نییە داوای لێ خۆش بوون بکەن بۆ موشریکەکان لەکاتێك دا بۆیان روون بووەتەوە کە ئەوان ئەھلی دۆزەخن .

---

(٧٨) بوخاری و موسلیم ریوایەتیان کردووە .

(٧٩) بوخاری و موسلیم ریوایەتیان کردووە .

براکەم مەسەلەکە زۆر ترسناکە ، بەلام ئەفسوس زۆر کەس تەمبەلی و گاڵتەی بەواجبی نوێژ دێت ئەمرەکەی بەساکاری وەرگرتووەو لەلای دەیانهێڵێتەوە لەناو ماڵدا لەکاتێکدا نوێژ ناکات و گاڵتەی پێ دەکات براکەم جائیز نییە .

ئەمەبوو حوکمی ئەو کەسەی کەنوێژ ناکات پیادێت یان ئافرەت ئەی ئەو کەسەی کەنوێژ ناکەیت یاخود تەمبەڵی دەکەیت فریای ئەوکاتانە کەوە بێت هێشتا لەژیانتا ماوەو بەکردەوەی چاکەو نوێژکردن بەسەری بەرە چونکە نازانی چەندە لەتەمەنت ماوە ساڵانێك یاخود چەندمانگێك یاخود رۆژانێك یان چەند ساتەوەختێك کەلە علمی خوادا بۆت دانراوە بەرەدەوامیش فەرموودەکەی خوای پەروەردگارت لەیاد بێت کە دەفەرموێت: ﴿إنه من يأت ربه مجرما فإن له جهنم لايموت فيها ولا يحيى﴾ (طه: ٧٤) ..واتە: هەرکەسێك بچێتە بارەگای خوداو تاوانباربێت ئەوا جەهەنەم شوێنیەتی نەتێیدا ئەمرێ و نەتێیدا دەژی و یان دەفەرمووێ: ﴿فأما من طغى وآثر الحياة الدنيا فإن الجحيم هي المأوى﴾ (النازعات: ) .. واتە: نازی هەرکەسێك تاوان بکات و زوڵم بکات ژیانی دنیا هەڵبژێرێت بەسەر قیامەتدا ئەوا جەهەنەم شوێن و مەئوایەتی .

خوای گەورە سەرکەوتوی بکات بۆ هەموو کردەوەیەکی چاکە هەموو رۆژەکانی ژیانتیشت ئاسوودە بکات و لەژێر سێبەری شەریعەتی ئیسلام دا ببێبە زانیاری و کردەوە پێکردنی و بانگ کردن بۆ شەریعەتەکەی .

## خوا گەورەش زانایە

وصل الله على نبينا وعلى آله وصحبه وسلم

ئێوارەی یەك شەممە

١٩٩٩/٤/١١

# نـــاوەڕۆك



بحمد الله